ئاینه كانی سه رده م

(١١)

# خه یالاتی مارکسیه ت

فاضل قه ره داغی

سلێمانی - ١٩٩٦

بسم الله الرحمن الرحيم

[وإن هذا صراطي مستقيما فاتبعوه ولا تتبعوا السبل فتفرق بكم عن سبيله]

# پێشەکی

ساڵی (١٩٨٩)ی زاینی ساڵی سەرەتای هەرەس هێنانی حکومەتانی دەوڵەتە گەورەو بچووکە کۆمۆنیستەکان بوو. لەگەڵ ئەم هەرەسەش دا بەشێکی حەقیقەتی ئەفسانەی ئەمەن کورتی کۆمۆنیزم بۆ ئەو کەسانە ئاشکرا بوو کەلەو حەقیقەتە پێ ئاگا بوون.

مارکسیەت ئەو فیکرەیەیە کەلەناو فیکرە جاهیلیەکاندا زۆرترین ئیدعای زانستیی و راستی ی بۆ خۆی کردووە. بەڵام لەراستی دا وەك دواتر بۆمان دەردەکەوێت نارێکترین فیکرەیەو دوورترینیانە لەزانستو بیرکردنەوەی زانستی.

ئەی کەواتە بۆچی مارکسیەت وا بڵاوبووەوە؟ مارکسی ی فەرەنسی (هنری لوفێفر) دەڵێ: مارکسیەت بەهۆی کاری سیاسی یەوە لەناو خەڵکدا بڵاوبوویەوە نەك بەهۆی زانستیی (علمیة)یەکەی(١) ئەمڕۆش دەبینین کەوا بەهۆی شکستی سیاسی یەوە مارکسیەت خەوتی جارانی نەماو بووە مۆدەیەکی کۆن.

ئەم کتێبە کورتەی دەستووسێکانە -کەلەبارەکەی دوو ئەوەندەیە- و زوو پێش هەرەسی حکومەتە کۆمۆنیستەکان دەستمان پێ کردبوو، ئەم کتێبەش زیاتر بۆ لایەنی فیکری ی مارکسیەت تەرخان کراوە. هەڵبەتە زۆر شتی تر هەیە کەبیڵێین بەڵام ئەوەندە بەسە بۆ ئەوەی کەبۆمان دەرکەوێ کەوا مارکسیەت وەکو هەموو فیکرەیەکی جاهیلی فیکرەیەکی زانستی نی یەو لەناو خودی خۆی دا نارێکە.

ئاتوانیوشانە رەخنەکانمان بابەتی یانە خستۆتە بەردەم خوێنەر بەڵام هەروا لەهەندێك شوێن دا شێوازی گاڵتەجاڕیمان بەکار هێناوە مافی خۆشانە چونکە کاتێك مارکسیەت باوی هەبوو چەکی مارکسیەکان دژی ئیسلام گاڵتەپێکردن بوو ئەمڕۆش نۆرەی ئێمەیە هەروەها مارکسیەت ئەوەندە بیروبۆچوونی ناتۆڵای تێدایە کەشایەنی گاڵتەپێکردنە.

لەکۆتایش دا دەڵێین: راستە مارکسیەت واخەریکە دەبێتە بابەتێکی مۆزەخانە بەڵام ئەم کتێبە لەدوو رووەوە پێویستە:

١- ئەم کتێبە راهێنانێکە بۆ خوێنەر لەسەر جەسپاندنی مەنهەجی قورئانی رەخنە.

٢- هێشتا ژمارەیەك کەس هەن لەدنیای خەیاڵاتی مارکسیەتدا دەژین.

---

١- هنري لوفيفر، الازمة للماركسية الراهنة، ل٢٤.

## بەشی یەکەم

# بناغەی فیکری جاهیلی

ئەم سەردەمەی کەتیایدا دەژین پڕیەتی لەئاینی (مۆدێرن)، بەڵێ! فیکرەکانی ئەمڕۆ ئاینن چونکە پێناسەی ئیسلام بۆ ئاین جیایە لەپێناسەی جاهیلیەت، جاهیلیەت ئاین دەبەستێتەوە بەمزگەوت و کڵێسەو (طقوس)ەوە، بۆیە جاهیلیەت فیکرەکانی خۆی بەئاین نازانێ.

جاهیلیەت لەئاین تێ نەگەیشتووە، ئاین بریتیە لەبیروبۆچوونێك سەبارەت بەبوون (وجود)و خوا، هەروەها بەرنامەیەکی ژیانە، لەبەرئەوە مارکسیەت و دیموکراسی و فیکری نەتەوایەتی و عەلمانیەت و وجودیەت... هتد هەموو ئاینن و لەهەموویاندا پەرستن هەیە بابەئاینیش ناو نەزێن و بابەپەرستنی رەسمیان تێدا نەبێ.

تایبەتی یەکی ئەم ئاینانەو پەرستگاکانیان و (کاهن)ەکانیان ئەوەیە کە رواڵەتێکی سەحکەم و درەوشاوەیان هەیە بەڵام لەگەڵ تاقی کردنەوەدا، بەڵکو تەنها بەلێکۆڵینەوە دەردەکەوێ کەوا ئەمانە وەکو خانووی جاڵجاڵۆکە بێ هێزن.. رواڵەتیان هەڵخەڵەتێنەرە وەکو خانووی جاڵجاڵۆکە، وادەزانی عەیبیان تێدا نیە تاکەو کاتەی دەیانخەیتە بەر تیشکی لێکۆڵینەوە یان خۆی دەکەوێتە ژێر رەحمەتی تاقی کردنەوە.

﴿مثلُ الذين اتخذوا مِن دونِ اللهِ اولياءَ كمثلِ العنكبوتِ اتخذتْ بيتاً وإنَّ أوهنَ البيوتِ لبيتُ العنكبوتِ﴾ العنكبوت/٤١.

واتە: نموونەی ئەو کەسانەی کەپشتوپەناو دۆست و خۆشەویست غەیری خوا بۆ خۆیان دادەنێن وەکو جاڵجاڵۆکە وان کەخانوویەك بۆ خۆی دروست دەکات، بێ هێزترین خانووش هی جاڵجاڵۆکەیە.

خوای گەورەش لەبارەی بیروباوەڕی موشریکە کۆنەکان دەفەرموێ ﴿إنْ يتّبعون الاّ الظنَّ وما تهوى الانفسُ﴾ کەواتە لێرەدا خوای گەورە دوو سەرچاوەو بناغەی فیکری جاهیلیان بۆ دەست نیشان دەکات:

١- شوێنکەوتنی گومان (لەجیاتی شوێنکەوتنی یەقین)

٢- شوێنکەوتنی ئارەزووی نەفس (لەجیاتی شوێنکەوتنی هەق)

خوای گەورە باسی موشریکەکانی (مەککە) دەکات کەحەزیان نەدەکرد کچیان بێ و زیندەبەچاڵیان دەکردن کەچی کچیان بۆ خوا دادەناو دەیانووت ئەم چەند بتە (هەروەها مەلائیکەت) کچی خوان.

﴿واذا بُشّرَ احدُهُمْ بالانثى ظلّ وجههُ مُسوَدّاً وهو كظيمٌ يتوارى من القوم مِنْ سوءِ مابُشّرَ بهِ أيُمْسِكُهُ على هُونٍ ام يدسّه في التراب ألاَ ساءَ مايحكمون﴾ النحل/٥٨-٥٩.

واتە: کاتێك مژدە بەیەکێکیان دەدرێ کەمێینەی بووە، ڕەنگی ڕەش هەڵدەگەڕێ‌و پیش دەخواتەوە، لەخراپی ی ئەم مژدەیەش خۆی لەخەڵکی دەشارێتەوە (نازانێ ئایا کچەکە) بەزەلیلی بیهێڵێتەوە یان بیخاتە ژێر گڵ.

کەچی هەر ئەمانەش بوون کەدەیانووت گوایە مەلائیکەت‌و چەند بتێك کچی خوان.

﴿أَفَرأيتم اللاتَ والعُزّى* ومناةَ الثالثةَ الاخرى* ألكم الذكرُ وله الانثى* تلك اذا قِسمةٌ ضِيزى﴾ النجم/١٩-٢٢.

واتە: ئەی (سەبارەت‌بە) (لات)و (عوززا)و (مەنات)ی سێیەم؟ نێرینە بۆ ئێوەو مێینە بۆ خوا؟ کەواتە ئەمە دابەش کردنێکی خواروخێچە.

بەم جۆرە موشریکەکان شتێکیان بۆ خوا دانابوو کەبۆ خۆیان حەزیان لێ نەدەکرد... ئەمەش ڕەفتارێکی جاهیلی‌یە کەنموونەی زۆرە لەفیکرو هەڵس‌و کەوتی جاهیلی ی ئەمڕۆدا.

لەبەرئەوە چ ئاین‌و بتە کۆنەکان‌و چ ئاین‌و بتە نوێکان تەنها «ناون»و هیچی تر، ناوێکی بێ ناوەرۆك، یان ناوێك کەلەگەڵ ناوەرۆکەکەی‌دا ناگونجێ، ئایەتەکەی دوای ئەو دەفەرموێ:

﴿انْ هيَ اسماءُ سمّيتُموها أنتم وآباؤكم ماأنزلَ بها منَ سلطان..﴾ النجم/٢٣.

ئەمانە تەنها چەند ناوێکن کەخۆتان‌و باوك‌و باپیرانتان ناوتان ناون، خوا هیچ بەڵگەیەکی نەناردۆتە خوارەوە لەبارەیانەوە.

هۆکەشی ئەوەیە:

﴿انْ يتّبعون الاّ الظنّ وما تهوى الانفسُ ولقد جاءَهم منْ ربّهمُ الهدى﴾

ئەمانە شوێنی تەنها گومان‌و ئارەزووی نەفس دەکەون، (لەکاتێکدا) هیدایەتیان بۆ هاتووە لەلایەن خواکەیانەوە.

ئالەم باسەدا چەندین نموونەی شوێنکەوتنی گومان‌و ئارەزوو دەبینین، هەروەها بۆشمان دەردەکەوێ کەوا ئەنجامێکی ئەم شوێنکەوتنە کۆکردنەوەی سەدو یەك شتی نارێك لەناو یەك فیکرەداو درووستبوونی هەزارو یەك نارێکی لەناوی‌دا.

شوێنکەوتنی گومان لەوەدایە کەهەڵگرانی فیکری جاهیلی بەبێ بەڵگە قسە دەکەن‌و بناغەی فیکرەکە دادەمەزرێنن، یاخود بەڵگەی وەهمی بەکار دەهێنن‌و بەرگی ڕاستی ی دەکەنە بەر.

﴿وما لهمْ بهِ منْ علم انَ يتبعون الاّ الظنّ وانّ الظنّ لايغني منَ الحقّ شيئاً﴾ النجم/٢٨.

واتە: ئەمانە زانیاری‌یان نی‌یە لەبارەی ئەمەوە، ئەمانە شوێنی تەنها گومان دەکەون

گومانیش هیچ بەکەڵکی هەق نایەت.

١- بۆیە دەبینین بتە کۆنەکان «مێژوو»یان هەیە، واتە ئەو بتەی کەلای موشریکەکان یەکێکە لە خواکان. ڕۆژێک لەڕۆژان «لەدایک بووە». خۆ ئەگەر خوای ڕاستەقینە بوایە دەبوایە لەسەرەتای بوونەوە هەبوایە، وەک چۆن لەعێراقی کۆندا (بۆ نموونە) ئێنلیل ENLIL هەبوو کەخوایەکی هەرە گەورەی سومەرییەکان بوو، بەڵام کەی پەیدا بوو؟ بۆچی دوایی نەما؟ ئاشکراشە کەمەسەلە تەنها گومان و زانیارییەکی بێ بەڵگەیە کە بۆتە هۆیەکی پەیدابوونی ئەم بتە لەسەر ڕووی زەمین.

ئەمڕۆش ئەگەر لەئاینە «مۆدێرن»ەکان بکۆڵیتەوە، دەبینی کەوا چەندین شتی گومانلاویان تێدایە بەڵکو بووشتەتە بەردی بناغەیان. ئەگینا کێ دەڵێ کەوا کۆمەڵگای سەرەتایی مەشاعی بوو (واتە: کۆمۆنیستێکی سادەو سەرەتایی) غەیری نووسراوێکی (مۆرگان) نەبێ کەدوای ماوەیەک دەرکەوت چەند پڕە لەهەڵەو قسەو بۆچوونی بێ بەڵگە؟ یان کێ دەڵێ کەوا پەرلەمان لەوڵاتێکی دیموکراتیدا نوێنەری ڕاستەقینەی گەلە(١)؟ یان کاتێک عەلمانیەت دەڵێ خۆم ناخەمە ناو کاروباری ئاین ئایا بەڕاستێتی و درۆ ناکات؟ یان کێ دەڵێ قەوارەی نەتەوەیی باشترین زامنە بۆ پاراستنی نەتەوەیەک؟ یان.. یان... ؟؟

بیناى گەورە گەورەی فیکری بەرز کراونەتەوە کەناوەویان پووچەڵە، بینای گەورە کەبناغەکەیان گومانە لەجیاتی هەق، بۆچوونی بێ بەڵگەیە لەجیاتی حەقیقەت.

ژمارەیەک بت و خوای ساختەو ئاینی هەڵبەستراو کەڕێی هەقیان لێ گوم بووە.

٢- خواوەندە ساختە هەرە گەورەکەش، سەرۆکی هەموو بتەکانی پەرستگای جاهیلیەتیش، یەکێکە کەزۆر نزیکە لێیان بەڵام هەستی پێ ناکەن، یەکێکە لەهەموویان شاراوەترە ئەویش (ئارەزوو)ە:

﴿أَفَرَأَيْتَ مَنِ اتَّخَذَ إِلَٰهَهُ هَوَاهُ...﴾ الجاثية/٢٣.

واتە: ئەو کەسەت بینی کەئارەزووی خۆی کردۆتە خوای خۆی؟

ئەو ئارەزووەی کەوای لەبت پەرستە کۆنەکان کردبوو حەز بکەن بەپەرستنی دارو تەختەو تەوتەم و پاشایان، هەر ئەو ئارەزووەشە کەوا لەبت پەرستە نوێکان دەکات کەحەز بەپەرستنی حزب و پێشەواو نەتەوەو وڵات بکەن.

ئەو ئارەزووەیە کەوای لە(مارکس) کرد بڵێ بەپەیابوونی کۆمەڵگای کۆمۆنیست حەتمی یەو هەر دەبێ بەدی بێت. خۆی حەزی لێ دەکرد، ئارەزووی لەگەڵدا بوو بۆیە بەدوای «بەڵگەی زانستی»دا دەگەڕا کەئەم حەتمی یەتە «بسەلمێنێ» هەر ئەو ئارەزووەشە کەوای لەوڵاتانی ئەورووپا کرد کەلەکاردانەوەی زوڵم و حوکمی تاکەکەسی پاشایان

(١)- ئەمە یەکێکە لەو ڕەخنانەی کەلە دیموکراسی دەگیرێن و هەندێک ڕۆشنبیرانی خۆیان باسی دەکەن، ئێمەش لەکتێبی دەستووردا (کەلەبارەی دیموکراسییەوەیە) ئەو شتانە باسی دەکەین.

بەرەو فیکرەی دەوکراتی بچن و ژمارەیەك کەسیان ببنە (مفکر)و تیۆر دانەر(منظر)ی ئەو فیکرەیە.

هەر ئەو ئارەزووەشە کەبووە سەرچاوەی رق هەڵسان لەئاین و بناغەیەکی پڕ گومانی دامەزراند بۆ ئاینی عەلمانی.

هەر ئەو ئارەزووەشە کەبناغە پڕ خورافەتەکەی ئەتەوەی هەڵبژێراوەو ئەرەگەزی باڵای بنیات نا، پاش لەکاردانەوەی زەلیل بوونی نەتەوەیی وزوڵمی نەتەوەکانی تر دەزووەکانی فیکرە نەتەوەییەکەی کۆکردەوە.

هەر خۆشێتی کەبەرامبەر (موضوعي)و (دەرەکی)یەکەی (هێگل) خۆیی (ذاتي) و(ناوەکی)یەکەی وجودیەتەکەی (کیرکیگارد)ی بزواند.

**لیستەکە دوورو درێژە بەڵام بناغەکە یەکە:**

١- ئارەزوو دروست کەرو بزوێنەری بیر :کردنەوەو هەستی مرۆڤی جاهیلە.

٢- بەهۆی ئەم ئارەزووە ش و بەهۆی کەمی زانیاریەوە، قسەو بۆچوونی بێ بەڵگە دادەمەزرێن.

٣- فیکرو بۆچوونی جاهیلی پەیدا دەبن کە بەهۆی دوو بناغەکەی سەرەوە پڕ دەبن لەناڕێکی، واتە هەر فیکرەیەك لەناو خۆیدا ناڕێکەو بەشێکی ئەو فیکرەیە ئەوەی تر بەدرۆ دەخاتەوە.

کارەکەمان لێرەدا ئاشکراکردنی ناڕێکی لەناو فیکرەی جاهیلیدایە واتە دەرخستنی ئەو راستیەیەی کەوا هەر بەشێك لەفیکرەی (س) ناڕێکە،لەگەڵ بەشەکەی تر و ناڕێکی لەناو هەر بەشێکیشدا هەیە، هەروەها ئاشکراکردنی ئەو بۆچوونانەی کەبەڵگەیان نیە غەیری گومان و دەرخستنی رۆڵی ئارەزوو تیایاندا.

**لەکۆتاییشدا دەزانین کەوا چەند راستە:**

**﴿ولو كان مِنْ عند غير الله لوجدوا فيه اختلافاً كثيراً﴾** النساء/٨٢.

واتە: ئەگەر ئەم قورئانە لەلایەن غەیری خواوە هاتبێ ناڕێکییەکی زۆریان تێدا بەدی دەکرد.

ئەمەش ئەو جیاوازییەیە کە لەنێوان زانیاریەك کەخوا سەرچاوەیەتی، ئەو خوایەی کەبەدی هێنەرو خاوەنی بوونەوەرە (بەم شێوەیەش لەهەموو کەسێك زاناترە)... و زانیاریەك کەعەقڵ و هەستی مرۆڤ سەرچاوەیانە، ئەو عەقڵەی کەسنووردارەو ئەو هەستەی کەسنوور نیە بۆ ئارەزووەکانی.

کەواتە دەبێ سەرچاوەی ئێمە لەبارەی مرۆڤ و کۆمەڵگاو ئەو سوننەتانەی کەلەگەردوونی کاردەکەن... ئەو سەرچاوەیە بێ کەقابیلی هەڵە نیە، ئەو سەرچاوەیەی بەدەستی پێغەمبەری راستەقینە نێردرابوو نەك شوێنکەوتنی ئپێغەمبەری ساختەکانی وەك

مارکس کەپێشبینی دەکرد کەلەدوارۆژدا (دوارۆژی سەردەمەکەی خۆی) کۆمەڵگای کۆمۆنیست بەرپا دەبێ یان وەکو پێغەمبەرە ساختە نوێکە: (فوکویاما)ی ئەمریکی (یابانی رەچەڵەك) کەپێشبینی کردووە کەوا پاش رووخانی رژێمی کۆمۆنیست و فاشی و ئەرستۆکراتی.. هتد. تەنها سیستەمی دیموکراتی رۆژئاوایی خۆی وەکو شێوازی حوکمی عەقڵانی پیشان دەدات و دوا رۆژ هەر بۆ ئەوە!!

ئەمە حەقیقەتی فیکرەکانی رۆژئاوایە بەڵام خەڵکی وڵاتە موسڵمانەکان کوێرانە شوێنیان دەکەون، موسڵمانانی ئەمڕۆ ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەریان (ﷺ) بەسەردا دەچەسپێ کەباسی ئەوە دەکات کەوا رۆژێك دێت موسڵمانان شوێنی سوننەتەکانی جوولەکەو نەصارا دەکەون تەنانەت ئەگەر بچنە ناو کونی مارمێلکە (کەچەند تەسك و بچووکە) موسڵمانان شوێنیان دەکەون و خۆیان دەخەنە ناوی.

موسڵمانانی ئەمڕۆ شوێنی جوولەکەو نەصارا کەوتوون و خۆیان خستۆتە نارەحەتی زۆر، لەجل و بەرگدا: رۆژئاواییەکان جلەکانیان تەسك بکەن ئەوانیش جلەکانیان تەسك دەکەن و هەناسەو جوڵە لەخۆیان نارەحەت دەکەن، فراوانی بکەن ئەوانیش فراوانی دەکەن، قژ درێژ بکەن ئەوانیش دەروێشانە قژ دەهێڵنەوە، بیتاشن ئەوانیش سەریان تاسا دەتاشن، ئەمە لەجل و بەرگ و سیما ئینجا لەئاکار و خورەوشت..هتد.

ئینجا لەو شتەی کەلێرە مەبەستمانە: شوێنکەوتنی رۆژئاواییەکان لەمۆد فیکرییەکانیان، موسڵمانانی ئەمڕۆ خۆیان کردۆتە تاقیگەیەکی تر بۆ ئەو فیکرانە، هەموو رۆژێکیش مۆدەیەکی فیکری.... بەبێ ئەوەی بزانن کەهەموو ئەمانە یەك خانە جێیان دەکەنەوە خانەی جاهیلیەت. هەموویان فیکری جاهیلین..کاتێك باون پرشنگدارن، کاتێکیش بەسەر دەچن ئاوڕیان لێ نادرێتەوە بەپێی زەمان و بارودۆخ پەیدا دەبن دەژین و دەگۆڕێن و دەمرن..لەهەموو قۆناغێکی ژیانیشیاندا کرۆکیان پووچەڵە.

زۆر لەموسڵمانانی ئەمڕۆ باوەشیان بەم پووچەڵیە کردووە، بێ ئاگان لەو ئاینەی کەتاقیامەت دەمێنێ، ئاینی کاروانی پێغەمبەران و شوێنکەوتوانیان، ئاینی خوا، ئیسلام.

بەشی دووەم

# کورتەیەك لەبارەی مارکسیەت

## ١- سۆشیالیزم و کۆمۆنیزم

لەکاتی کارل مارکس (١٨١٨-١٨٨٣)و فریدریك ئینگلزدا (١٨٢٠-١٨٩٥)(٢) ئەوروپا پڕ بوو لەقوتابخانەی سۆشیالیست و کۆمۆنیست و قوتابخانەکەی ئەوان تەنها یەکێك بوو لەچەندینی تر(٣).

زاراوەی سۆشیالیزم (الاشتراکیة Socialism) لە سۆشیالیستەوە هاتووە کەئەو کەس و ئەو بلاوەیە کەبایەخ بەکۆمەڵگا society دەدات و دژی (تاکرەوە indivitualist)(٤). کۆمۆنیزمیش (الشیوعیة Communism) پێشتر ئەو ناوەبوو کەلەبیروڕای ئێتیان کابێت E.Cabet ی فەرەنسی دەنرا (لەپەنجاکانی سەدەی نۆزدەی زاینی)(٥).

سۆشیالیزم کاردانەوەیەك بوو دژی چەوساندنەوەی کرێکاران لەلایەن بۆرجوازیەت و دژی باری سەختی کارکردنی پرۆلیتاریا (کرێکاران) کەرۆژانە دوازدە سەعات کاریان دەکرد بۆ موچەیەکی کەم و لەناو خانووی شڕدا بەژمارەیەکی زۆر دەژیان ..هتد.

ئەمڕۆش کۆمۆنیزم تەنها بەفیکرەی مارکسی دەوترێ. جگە لەمارکسیەت قوتابخانە سۆشیالیستەکان زۆرن وەکو:

١- نەتەوەیی سۆشیالیست (القومیة الاشتراکیة) کەنازیەت گەورەترین نوێنەرێتی هەروەها زۆر لەحزبەکانی وڵاتانی جیهان وەکو حزبی بەعس و ئەمانە زیاتر قەومین.

---

٢- لێرەدا ناوی کەسەکانم بەو شێوەیە نوسیوە کەلەزمانی خاوەنەکانی دا دەوترێن بەلام لەناوی سەرچاوەکاندا لەکۆتایی کتێبەکەدا ناوەکانم بەو شێوەیە نووسیوە کەلە وەرگێرانی عەرەبیی کتێبەکان دا هاتوون. لەو ناوەش کەگومانم لەخوێندنەوەکەی هەبووە نیشانەی پرسیارم لەبەرامبەر دا داناوە. ئەوەشم لەبەر ئەوە کردووە چونکە زۆربەی هەڵە ناوەکان بەهەڵە دەڵێنەوە. جگە لەناوەکانیش گوێمان نەداوەتە ئەو زاراوانەی کەلەئەدەبیاتی مارکسی ی کوردی ئەمڕۆدا بەکار دێن و خۆمان زاراوە عەرەبیەکانمان وەرگێڕاوە بۆیە لەوانەیە هەندێك جیاوازی ببینرێت لەنێوان زاراوەکانی ئەم کتێبەو زاراوەکانی لای مارکسیە کوردەکان کەبەزۆری لەئەدەبیاتی فارسییەوە وەرگیراون.

٣- بۆ زانیاری لەبارەی ئەو قوتابخانانە بڕوانە کتێبە دوو بەرگیەکەی (ج. د. هـ کۆل) تاریخ الفکر الاشتراکي (بڕوانە سەرچاوەکان).

٤- ج. د. هـ. کۆل، رواد الفکر الاشتراکي، ل١١ بەدواوە.

٥- هەمان سەرچاوە.

٢- سۆشیال دیموکرات: ئەویش بیروباوەری سۆشیالیست و دیموکراتی ی تێکەڵ بەیەك کردووەو بەشی زۆری حزبە سۆشیالیستەکانی ئەوروپا لەم جۆرەن. سۆشیال دیموکرات بروای بەدەست ڕۆیشتنی دەوڵەتە لەبواری ئابووری و کۆمەڵایەتی و بۆ بەدیهێنانی سۆشیالیزم.

٣- سۆشیالیزمی مەسیحی: کەلەسەدەی ڕابردوودا کاری دەکردو پشتی بەبنەماکانی نەصرانیەت و ژیانی نەصرانی یە کۆنەکان دەبەست.

٤- هەموو قوتابخانە سۆشیالیستەکانی سەدەی ڕابردوو وەکو ئەوانەی سان سیمۆن و فۆریێ و ئۆوین.. هتد.

بابەتی هاوبەشی نێوان هەموو سۆشیالیستەکانیش ئەوەیە کەهۆکانی بەرهەم هێنان (کارگەکان...هتد) لەدەستی تاکە کەسەکانەوە بچنە دەستی کۆمەڵگا. لەم مەسەلەیەش دا کەسی وا هەیە دەیەوێ بەشێکی هۆکانی بەرهەمهێنان بچنە دەستی کۆمەڵگا، هەیشە دەیەوێ هەموو هۆکانی بەرهەمهێنان لەدەستی کۆمەڵگادابن (وەکو مارکسیەکان). جیاوازی زۆری تریش هەیە لەنێوان قوتابخانەکاندا کەلێرەدا ناکرێ باسیان بکەین.

## ٢- سەرچاوەکانی فیکری مارکسی

فسەیەکی باوی مارکسیەکان هەیە ئەویش کەوا مارکسیەت سێ سەرچاوەی هەیە:

١- فەلسەفەی کلاسیکی ئەڵمانی بەتایبەتیش هی (هیگل)و بەرادەیەکی کەمتر هی فەیلەسووفی ماددی (فۆیەرباخ).

٢- سۆشیالیزمی فەرەنسی.

٣- ئابووری ی سیاسی ی ئینگلیزی (الاقتصاد السیاسي الانکلیزي).

لەبەر گرنگیی ی فەلسەفەی هیگل لەمارکسیەتدا لێرەدا (بەوپەری کورتی) باسی مەنهەجی فەلسەفەکەی دەکەین واتە مەنهەجی دیالێکتیکی لەم چەند خاڵەدا:-

١- لای هیگل مەنهەجی بیرکردن دەبێ یان دیالێکتیکی بێ یان میتافیزیکی(٦) مەنهەجی میتافیزیکی هەموو شتێکی ئەم بوونەوەرە: بیر (الفکر)، بوون (الوجود)... جیادەکاتەوە بۆ چەند بەشێکی سەربەخۆ بەجۆرێك کەپەیوەندیان بەیەکەوە نەبێ، بەڵام لای مەنهەجی دیالێکتیکی هەموو شتێك پەیوەندی بەوەی ترەوە هەیە.

٢- مەنهەجی میتافیزیکی بروای بەلەوێنی (الهویة) هەیە ئەویش کەفلانەشت «خۆیەتی»و ناکرێ لەیەك کاتدا «خۆی» بێ‌و«خۆی» نەبێ». بەڵام لای دیالێکتیك ئەم شتە هەیە.

---

٦- مەبەست لێرەدا لە(میتافیزیك) بەرانبەر (ماوراء الطبیعة) ی یە.

٣- دیالێکتیکیش لای هێگل تەنها بیرکردنەوە نی یە بەڵکو دیالێکتیک لەواقیعدا لە ناو هەموو شتێکدا هەیەو دروستکراوی خۆشیان نی یە.

٤- دیالێکتیکو هەموو فەلسەفەی هێگل بریتین لەژمارەیەکی زۆری سێگۆشەو هەر سێگۆشەیەک بەم جۆرەیە:

بابەتێکمان هەیە (موضوع، قضیة). ئەمە نەفی دەبێ یاخود خۆی نەفی دەکاتو دەبێتە دژ (نقیض). ئەمەشیان دیسان نەفی دەبێو بابەتەکە دەگەرێتەوە بەلام بەشێوەیەکی بەرزتر ئەویش ناوێتە (مرکب)ی پێ دەوترێ. ئەم چالاکی یەش بەردەوام دەبێ تا دەگەیتە رەها (المطلق).

ئەم خاڵە شیان زۆر بەکورتی باس کردووەو لەکورتەکانی مارکسیەکان دەچێ کاتێک کەباسی دیالێکتیکی هێگل دەکەن. هەموو خاڵەکانیش دیسان زۆر بەکورتی باسکراون. ئەگینا دیالێکتیکی هێگل زۆر لەمە فراوانترو ئاڵۆزترە(٧).

هەرچەندە مارکسیەت فەلسەفەیەکی ماددی یە بەلام سوودی زۆری لەفەلسەفە (مثالي)یەکەی هێگل وەرگرتووە. بەتایبەتیش لەمەنهەجەکەی (واتە: دیالێکتیک)و مارکسو ئینگلز دەڵێن کەوا مەنهەجەکەی هێگلیان وەرگرتووە نەک چەسپاندنی مەنهەجەکەی (کەبەچەسپاندنەکە دەوترێ: المذهب).

## ٢- بەشەکانی مارکسیەت

مارکسیەت بریتی یە لەسێ بەش:

یەکەم: ماددی یەتی دیالێکتیکی (المادیة الجدلیة): مارکسیەت فەلسەفەیەکی ماددی یە. بەپێی بەش کردنە ساکارەکەی فەلسەفەش: فەلسەفە یان ئایدیالی (مثالي)ە یان ماددی. لای فەلسەفەی (مثالي) بیر سەرەتاو ئەساسە، بەلام فەلسەفەی ماددی ماددە پێش دەخات.[١]

ماددی یەت ماددە بەئەساس دادەنێو دەڵێ کەوا بیروگیان دروستبووی ئەوون. بەلام مارکسیەت خۆی بەماددی دیالێکتیکی دەزانێو خۆی جیا دەکاتەوە لەماددی یەتی میتافیزیکی) کەنادیالێکتیکی یانە بیردەکاتەوە.

ئەمە بۆ ماددیەت، بۆ دیالێکتیکیش ئینگلز سێ یاسای سەرەکی ی دیالێکتیک جیا دەکاتەوە (کەلای هێگل بەشێوەیەکی تر هەن):

---

٧- بۆ شارەزایی زیاتر لەفەلسەفەی هێگل بروانە:

١- امام عبدالفتاح امام: المنهج الجدلي عند هيجل ٢- و. ستەیس، فلسفة هيجل ٣- د. زكريا ابراهيم، هيجل او المثالية المطلقة ٤- ر. گارۆدی، فكر هيجل.

١- یاسای گۆڕانی چەندو چۆنی (قانون التحولات الكمية والكيفية): ئەویش ئەو حالاكیە پیشان دەدات كەتیایدا گۆڕانی چەندی (=كمی)ی شتێك یانی دیاردەیەك لەكاتو پلەیەكی دیاریكراودا دەبێتە هۆی گۆڕانی چۆنێتی ی ئەو شتە. بۆ نمونە پلەی گەرمای ئاو بەرە بەرە بەرز دەبێتەوە تادەگاتە (١٠٠) پلەی سەدی، لەم حاڵەشدا چۆنێتی ی ئاوەكە دەگۆڕێو ئاوەكە دەبێتە هەڵم.

٢- یاسای یەكێتی و ملاملانەی دژەكان: هەموو شتێك دژی خۆی هەیە، دژەكانیش لەسەرەتادا لەیەكێتی دان بەڵام كاتی بەو دوایی ملاملانە دەكەنو لەئەنجامدا دژێك سەردەكەوێ.

٣- یاسای نەفی ی نەفی: هەموو شتێك دژی خۆی دروست دەكات ئەم دژەش نەفی ی ئەو شتە دەكات بەڵام ئەویش نەفی دەبێو شتی یەكەم پەیدا دەبێتەوە بەڵام بەشێوەیەكی دەوڵەمەندتر، بۆ نمونە دەنكە جۆیەك نەفی دەبێو دەبێتە رووەك ئەم رووەكەش نەفی دە بێو دەبێتە گوڵەجۆ، بەم شێوەیە شتی یەكەمان دەست دەكەوێ (دەنكە جۆكە) بەڵام بەژمارەیەكی زۆرتر.

٤- یاسای پێكەوە بەستانی هەمەكی ی نێوان دیاردەكان (الترابط الكلي بين الظواهر) كەبایەخی پێ نەدراوە تێمەش لێرەدا پشت گوێ ی دەخەین.

جگە لەیاساكان؛ وتەكان (المقولات) هەن كەلەم كتێبەدا باسیان ناكەین.

دووەم: ماددیەتی مێژوویی: ئەمیشیان زووتر لەمێشكی ماركس و ئینگلزدا لەدایك بوو. ماددیەتی مێژوویی لەگشتی ترین یاساكانی گەشەسەندنی كۆمەڵایەتی دەكۆڵێتەوە. ئەمەش چەند بلوەڕێكی ئەم بەشەیە:-

١- بەرهەم هێنانی كەلو پەلی ماددی لەسەرەتای مێژووی مرۆڤدا دروستكەری هۆشی مرۆڤەكان بوو.

٢- ژیانی كۆمەڵایەتی ی كۆمەڵگا دروستكەری هۆشی خەڵكەكەیە (ژیانی كۆمەڵایەتیش زیاتر لایەنی بەرهەم هێنان دەگرێتەوە).

٣- لەهەر كۆمەڵگەو سەردەمێكدا جۆرێكی بەربڵاو یان سەرەكی ی بەرهەم هێنان هەیە وەكو: دەرەبەگایەتی، سەرمایەداری ...هتد. ئەم جۆری بەرهەم هێنانە لەدوو بەش پێك دێت:

أ) پەیوەندی مرۆڤ بەسروشت: ئەم پەیوەندەش (هێزەكانی بەرهەم هێنان) دەری دەخەن. ئەم هێزانەش بریتین لەئامێرەكان كە پێیان دەوترێ (هۆكانی بەرهەم هێنان) هەروەها بریتین لە مرۆڤەكان خۆیان.

ب) پەیوەندی نێوان مرۆڤەكان: ئەویش كە (پەیوەندەكانی بەرهەم هێنان) دەری دەخەن. ئەم پەیوەندانەش بریتین لە: دابەش كردنی كار، كڕین، فرۆشتن، ...هتد.

٤- (پەیوەندەکانی بەرهەم هێنان) بەهۆی گەشەسەندنی (هێزەکانی بەرهەم هێنان) دەست نیشان دەبن. بۆ نموونە ئەو ئاشەی کەبەدەست دەخولێتەوە کۆمەڵگای دەرەبەگایەتی پیشان دەداتو ئەو ئامێرەی کەبەهێزی هەڵم دەجولێتەوە کۆمەڵگای بۆرجوازی پیشان دەدات(٨).

٥- هۆکانی بەرهەم هێنان گەشەدەسەنن ئاەو خاڵەی کەتیایدا (تناقض) نێوان ئەم پلە گەشەسەندووەو ئەو پەیوەندە کۆنانەی بەرهەم هێنان دروست دەبێ. پەیوەندە کۆنەکانیش دەبنە کۆسپ بەرامبەر گەشەسەندنی هێزەکانو دەبێ نەمێنن و بگۆڕدرێن. بۆ نموونە دەرەبەگایەتی بووە کۆسپ بەرامبەر گەشەسەندنی هێزەکانی بەرهەم هێنان بۆیە لەناوچووو بورجوازیەت هاتە جێی.

٦- لەکۆمەڵگایەکدا کەهۆکانی بەرهەم هێنان تیایدا لەدەستی ئاکەکەسەکان دایە دوو چینی دژ بەیەك هەن کەیەکێکیان ئاغایەتی دەکات. ململانەی چینەکان دروست دەبێو وەکو (مانیفێستۆی کۆمۆنیست- البیان الشیوعي) -کەنوسراوی مارکس و ئێنگلزە- دەڵێ: «مێژووی هەر کۆمەڵێك مێژووی ململانەی چینەکانە»(٩).

٧- لەمێژوودا شەش جۆری بەرهەم هێنان هەن کەپێنجیان سەر بەئەوروپان و زنجیرەیەك دروست دەکەن. لەگەڵ جۆرێکی تر کەسەر بەناوچەی ترە (قسەی ئەوسانش ئەوەیە کەوا پێنج جۆرەکە سەرانسەری جیهانیان گرتۆتەوەو ئەمە قسەی هەندێك مارکسی ئەمڕۆشە):

أ) کۆمیونی سەرەتایی: لەسەرەتای مرۆڤایەتیدا هەبووەو تیایدا خاوەنێتی (الملکیة) گشتی بوو واتە هۆکانی بەرهەم هێنان هی هەموو کۆمەڵگا بوو، کەواتە چینەکانو دەوڵەت و خێزان نەهاتبوونە کایەوە، ئافرەتیش رۆڵی سەرەکی دەبینی (سیستەمی دایك سالاری).

ب) کۆیلایەتی: بەهۆی گەشەسەندنی ئامێرەکانی بەرهەم هێنان بەرهەم زیاد بووو مرۆڤێك یان چەند مرۆڤێك ژمارەیەك خەڵکیان خستەکار بۆ خۆیان. دیلەکانی شەڕیش کرانە کۆیلەو ئەمانە بوونە هێزی بەرهەم هێنان. چینەکان پەیدا بوون کەدوو چین بوون: کۆیلەکانو خاوەنەکانیان... پلەی پیاویش بەرزتر بوو (باوك سالاری)و خێزان پێکهاتە بۆ سەرکوت کردنی یاخی بووەکانیش دەوڵەت پەیدا بوو.

ج) جۆری دەرەبەگایەتی: کۆیلایەتی بووە کۆسپ بەرامبەر گەشەسەندنی بەردەوامی هۆکانی بەرهەم هێنان. بەهۆی شۆڕشی کۆیلەو بەهۆی هێرشی خێڵە دڕندەکان دەوڵەتی سەرکەزی نەماو حوکمی دەرەبەگەکان پەیدا بوو. چینەکانیش دوو چینی دەرەبەگەکانو جووتیارەکان بوون.

---

٨- بڕوانە: کارل مارکس، بؤس الفلسفة، ل١١٢.

٩- جان - ئیف کالفێز، فکر کارل مارکس، بەرگی یەکەم، ل١٦٩.

د) سەرمایەداری: بەهەمان شێوە دەرەبەگایەتی بووە کۆسپ و لاچووو سەرمایەداری پەیدا بوو کەدوو چینی تیادا بەدی دەکرێ: بوورجوازیەت و چینی کرێکار (پرۆلیتاریا).

هـ- کۆمۆنیزم: ئێستاش سەرمایەداری کۆسپە و دەبێ نەمێنێ ئەویش بەشۆرشی پرۆلیتاریاو کۆمەڵگای کۆمۆنیست بەدی دێت کەهیچ جێنێکی تیادا نامێنێ و دەوڵەت لەناو دەچێ...هەموو کەسێکیش بەپێی توانا کاردەکات و بەپێی پێویست بەرهەمی دەست دەکەوێ.

و) جۆری ئاسیایی بەرهەم هێنان: مارکس نەختێك باسی ئەم جۆرەی کردبوو مارکسیەکانیش ناچاربوون باسی پێ بدەن چونکە تەماشایان کرد کەپێنج قۆناغەکە تەنها بەسەر ئەوروپا (یان بەشێکی ئەوروپا)دا دەچەسپێ. تایەتی سەرەکیش لەم جۆرە: ئەوەیە کەزەوی مەشاعیە (واتە موڵکی تاکە کەسەکان نیە) بەلأم دەوڵەت ئەم مەشاعیەتە بەکار دەهێنێ بۆ خۆی(١٠).

٨- دوو زاراوە هەن: ژێرخان (البناء التحتي) و سەرخان (البناء الفوقي): (ژێرخان) بریتیە لەباری کۆمەلایەتی کەشێوازی بەرهەم هێنان دەری دەبرێ و (سەرخان) بریتیە لەپەیوەندە رامیاری و یاسایی و ئاینیەکان...هتد. ژێرخانیش سەرچاوەی سەرخانە بۆ نموونە سەرمایەداری لایەنی سیاسی و یاسایی تایبەتی خۆی دروست دەکات کەلەهی ئەوانەی کۆیلایەتی و دەرەبەگایەتی.. هتد جیاوازە.

ئەمەش چەند لایەنێکی سەرخانە:

أ- دەوڵەت: دەوڵەت لەگەڵ دروستبوونی کۆمەڵگای چیندار دا درووست بوو دوای نەمانی چینەکان نامێنێ.

ب- ئاکار (الاخلاق) : ئاکاری جۆری بەرهەم هێنانی دەرەبەگایەتی (بۆ نموونە) جیایە لەئاکاری جۆری سەرمایەداری چونکە هەر یەکێکیان هەڵقولاوی بارێکی کۆمەلایەتی جیاوازە. لەلایەکی تریشەوە هەر چینێك و ئاکاری تایبەتی خۆی هەیە بەم پێیەش ئاکار نیە و کانیە.

ج- ئاین: کەمارکس دەڵێ (ئاین ئەفیونی گەلانە) مەبەست ئەوە نیە کەئاین دەستکردی چینە چەوسێنەرەکان بێ(١١)، بەڵکو مەبەست ئەوەیە باری کۆمەلایەتی دروستی دەکات و هەڵقوولاوی ئەوە.

د- لایەنی تر(یاسا، فەلسەفە، هونەر...) هەر یەکێك و هەڵقوولاوی بارە

---

١٠- بۆ زیاتر شارەزابوون بڕوانە: حول نمط الانتاج الاسيوي.

١١- بڕوانە: ئێرنست فیشەر، هكذا تكلم ماركس، ل١٩.

کۆمەڵایەتی یەکەی سەردەمی خۆیەتی بۆیە پاساو فەلسەفەو هونەری جۆری کۆیلایەتی (بۆنموونە) جیاوازە لەهی دەرەبەگایەتی یان سەرمایەداری..

سێیەم: ئابووری سیاسی (الاقتصاد السیاسي): ئەم سێیەم بەشەی مارکسیەت لەپاسی (ماددیەتی مێژوویی)دا و بەتایبەتی لەبەشی (سەرمایەداری)و (کۆمۆنیزم)دا بەکورتی لێی دەکۆڵینەوە بەشێکی سەربەخۆی بۆ دانانێین. ئەگینا کتێبەکە لەمە گەورەتر دەبێ.

شایەنی باسە بەشێکی زۆری بۆچوونەکانی مارکس و ئێنگلز کەسانی تر ووتبویان چ دوور چ نزیك لەو شێوەیەی ئەوان باسیان کردبوو وەکو:

١- دیالێکتیك لەهێگل وەرگیراوە (ئەویش هەندێك رووی لەفەیلەسوفی پێش خۆی وەرگرتبوو).

٢- بەشێکی ماددیەت لەفۆیەرباخ وەرگیرابوو.

٣- هەژاربوونی بەردەوام بووی پرۆلیتاریا.

٥- درووشمی لەهەر کەسێك بەپێی توانا..هتد.

٦- گرنگترین بەشی ئابووری سیاسی: (زیادەها- فائض القیمة).

بەشی سێیەم

# ڕەخنـــــە

ئێستاش دێین (مەنهەجی قورئانی بۆ ڕەخنەگرتن لەفیکری جاهیلی. ) دەچەسپێنین بەسەر مارکسیەتدا. بەهەڵەش لەمە تێ نەگەین.. ئێمە کەدەڵێین مەنهەجی قورئانی دەچەسپێنین ئایەتەکانی قورئان ناهێنینەوە. ئەو ئایەتانەی کەمارکسیەکان بڕوایان پێیان نی یە، بەڵکو باوەڕەکانی مارکسیەت خۆی دەدەین لەیەك تادەربکەوێ مارکسیەت چەند لەناو خودی خۆیدا ناڕێکە هەروەها زانست و ڕاستیە مێژوویی یەکان دەکەینە شایەت لەسەر پووچەڵی ی مارکسیەت.. مەنهەجە قورئانی یەکە وامان فێر دەکات: پووچەڵ کردنی فیکرەی جاهیلی بەوەی کەفیکرە خۆی بەکاربێنین و باوەڕەکانی بـ ـدەین لەیەك.

پاش چەسپاندنی ئەم مەنهەجەش ئەم سێ شتەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە:

١- زۆربەی بۆچوونەکانی مارکسیەت زانستی نین و بێ بەڵگەن.

٢- مارکسیەت لەناو خودی خۆیدا ناڕێکە.

٣- حەقیقەتی مارکسیەت پێچەوانەی ئەو شتەیە کەئیدیعای دەکات بۆ خۆی واتە نەزانستی یەو ئەوالیمی یەو نەدیالیکتیکی و تەنانەت لەهەندێك ڕووشەوە ماددیش نی یە.

## یەکەم ــ مارکسیەت و زانست

لەو بڕوایەدا نیم کەفیکرەیەك هەبووبێ ئەوەندەی مارکسیەت ئیدیعای (زانستێتی)و (پێشکەوتنخوازی)ی کردبێ. جادەبێ حەقیقەتی ئەم دوو ئیدیعایە چی بێ؟

بەر لەهەموو شتێك باتەوە بڵێین کەوا ئەگەر مارکسیەت بەڕاستی فەلسەفەیەکی زانستی بووایە مارکس و ئینگلز ئەو هەموو پێشبینیانەیان نەدەکرد کەیەك لەدوای یەك کەلەدەرچوون تەنانەت لەو کاتەدا کەهێشتا لەژیاندا بوون.. ئەم پێشبینیانە کەئاوا بەدرۆ دەکەوتنەوە بوونە هۆی ئەوەی کەهاوچەرخەکانیان بە(پێغەمبەری ساختە) ناویان بەرن(١٢).

تەنها ئەوانیش لەزانستەوە دوور نەبوون، بەڵکو ئەمە میراتی یەك بوو کەبۆ ئەوانەی دوای خۆیان بەجێیان هێشت. پاش مارکس و ئینگلز، زانا سۆڤیەتی یەکان سەرەتا دژی تیۆری نیسبی ی (ئاینشتاین) وەستابوون (بەڵام لەهەمان کاتدا بەکاریان دەهێنا بۆ تاقی کردنەوە ئەتۆمی یەکان) پاشان ناچاربوون دان بنێن بەوەی کەتیۆرەکە ڕاستە

١٢- بڕوانە: فرانتز مێهرنگ، کارل مارکس، تاریخ حیاتە، ل١٥٩. (مێهرنگ ئیش مارکسی یەکی هاوچەرخی مارکس و ئینگلز بوو. بڕوانە لاپەڕە ٩٢و٢٥١و٢٧٧-٢٧٨و٤٠٢.....ی هەمان سەرچاوە وەك نموونە لەسەر پێشبینی یە هەڵەکان.

بەڵام ڕەخنەیان دەگرت لەبیروبڵاوەرە فەلسەفییەکانی ئاینشتاین‌و ڕەخنەیان دەگرت لە هەندێك ئەنجام کەلەسەر بناغەی تیۆرەکە دانرابوون(١٣).

زانای سۆڤیێتیش: ترۆفیم لیسنکۆ(؟T.Lysenko) مەرجی ئەوەی دادەنا بۆ هەر لێکۆڵینەوەیەکی زیندەوەرزانی کەڕێك بێ لەگەڵ (ماددی‌یەتی دیالێکتیکی)داو دژ بەهەر لێکۆڵینەوەیەك بوو کەلەگەڵیدا نەگونجێ(١٤)و گوایە جیاوازی «دۆزیبووەوە» نێوان زیندەونیهانی کۆمۆنیست‌و زیندەوەرزانی بورجوازی(١٥)!!

مارکسیەکان هێرشیان دەبردە سەر هەر زانستێکی نوێ بۆ نموونە (جیۆپۆلیتیك)(١٦) کەگوایە زانست نی‌یە(١٧)، هەروەها (سایبێرنیتیك) کەلەبواری کۆمپیوتەردا بەکاردێت‌و کەبەزانستێکی بورجوازی‌یان دەزانی، ماوەیەکیشی پێ‌چوو کە زانا سۆڤیێتی‌یەکان وورپابوونەوەو بینیان چەند لەتەکەلۆجیای کۆمپیوتەردا دواکەوتوون(١٨).

ڕەنگەئەمە بەس بێ وەك نموونە لەسەر چەسپاندنی عەمەلی‌ی «زانستخوازی»و «پێشکەوتنخوازی»ی مارکسیەکان ئینجا بلمارکسیەت خۆی وەربگرین‌و بزانین چەند «زانست»ی تێدایەو چۆن ئەو شتەی کەلای ئەو «زانستە» لەراستی‌دا تەنها گومان‌و قسەی بێ بەڵگەیە.

## ١- یەکەمێتی‌و بێ سەرەتایی ماددە :

لای مارکسیەکان ماددە سەرەتای نی‌یە، دوای دەزانین «بەڵگەکان» چین‌و پێشتر باگوێ بگرین بۆ هاوڕێ (پلێخانۆڤ) کەهاوڕێ (لینین) ئامۆژگاری‌ی مارکسیەکان دەکات کەوا کتێبەکانی بخوێننەوە.

پلێخانۆڤ دەڵێ کەوا ماددیەکان قەد نەیانتوانیوە کەوا ڕێبازەکەیان دەتوانێ وەڵامی ئەم پرسیارە بداتەوە: لەکوێوە هەموو شتێك پەیدا دەبێ(١٩).

---

١٣- بڕوانە کتێبی کۆنە کۆمۆنیستی یوگوسلاڤی میلۆڤان جیلاس (؟): مجتمع غیر کامل، ل٩٢-٩٨.

١٤- بڕوانە: د. امام عبدالفتاح امام، خرافة الجدل فی الطبیعة، الفصول الاربعة، ژمارە ٧، ل٩٢

هەروەها: ئێدیث کیرزوێل (؟): عصر البنیویة، ل٤٤.

١٥- عصر البنیویة، ل٤٤. بۆ گیانی حزبایەتی و مل کەچ کردنی زانست بۆ مارکسیەت بڕوانە: جیدانۆڤ (؟)، حول تاریخ تطور الفلسفة کەلە بەرگەوە تابەرگ حزبایەتی‌یە. کابرایش شەریکە تاوانی ستالین بوو و پاش چەند ساڵێك بەرەسمی تاوانبار کرا.

١٦- جیۆپۆلیتیك: لەکاری جوگرافیاو دانیشتوان لەسەر سیاسەتی دەرەوەی وڵات دەکۆڵێتەوە.

١٧- ئافاناسیێف، اسس الفلسفة الماركسية، ل ١٦٥، هەروەها ڕۆجێ گارۆدی، الروح الحزبية في الفلسفة والعلوم، ل٢١. دوایی هەر گارۆدی خۆشی بوو کەڕەخنەی لەم هەڵوێستانە دەگرت (بڕوانە پەراوێزی خوارەوە).

١٨- ر. گارۆدی، ماركسية القرن العشرين، ل ٣٥ هەروەها: منعطف الاشتراكية الكبير، ل١١٦.

١٩- پلێخانۆڤ، تلك ...، ل٢١٨.

﴿إن نظن الا ظنا وما نحن بمستيقنين﴾ الجاثية/٣٢.

تەنها گومانمان هەیەو دڵنیانین (موشریکە کۆنەکان وایان دەووت) بەڵام پلیخانۆف دەڵێ کەوا ئەمە ڕێ لەماددیەکان ناگرێ کەرێبازەکەیان بەباشترین فەلسەفە بزانن و داوامان لێ دەکات کەلەجیاتی سەربەشاندنی ماددیەکان بەم پرسیارانە بارەختەگر خۆی ئەم ماددیانە بەدرۆ بخاتەوە(٢٠)!!

ئەمەش وەکو ئەوەیە پلیخانۆف بڵێ: ئەم قەڵەمەی دەستم کەلەم قسە توڕەهاتەم پێ نووسیوە لەکارگەیەکی بنی دەریادا دروست کراوە..ئێمەش لێی دەپرسین: بەڵگەت چی یە؟ ئەویش دەڵێ: سەرم مەیەشێنن و ئێوە بەڵگەم بۆ بهێنن کەلەوێ دروست نەکراوە ئێمەش دەڵێین: ئەمە کاری تۆیە بەڵگەی چیت بۆ بدۆزینەوە؟ ئەویش ئەو ئەنجامەی کەپێشتر بڕیاری دابوو دەخاتە بەردەممان و دەڵێ: کەواتە قسە قسەی منە.

مەسەلەش تەنها کەللە رەقی و سەرلێشێوانە ئەگینا (پلیخانۆف) دەزانێ کەوەڵام دانەوەی پرسیاری (ئەزەلیەتی مادده یەعنی چی و چۆنە؟) چەند سەختە بە ئکو وەڵامیشی نی یە بۆیە لەجیاتی بەڵگە هێنانەوە لەسەری داوامان لێ دەکات کەخۆمان بەدرۆی بخەینەوە پاش گەشتە سەرلێشێواوەکەشی قسەیەکی تەمو مژاوی دەڵێ: «تەنیا هێنانەوەی ئەم پرسیارانە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەوا گیانی رەخنەیی ی پرسیارکەرە بێزارەکە سست بووە»(٢١)!!.

کاتێ ئینگلز ئانتیگێن دوورینگ‌ای ماددی هەبوو کە جوڵەی ئەزەلی ی جیهانی نەچووبووە مێشك و دەبوت کەوا ئەگەر جیهان بێ سەرەتا بێ لەرووی کاتەوە ئەوا هەر خاڵێکی کات رەنگی ئەزەلی یەتی پێوە دەنیشێ(٢٢). ئینگلزیش دەیزانی کەوا ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کەدەبێ کەسێك هەبێ جیهانی جوولاندبێ (واتە: خوا) بۆیە هێرش دەباتە سەر دوورینگ و دەڵێ کەوا دوورینگ گوێی نەدابووە مەترسیەکانی قسەکەی خۆی(٢٣) بەم جۆرە بڕیارەکە ئامادەیە: نابێ هیچ شتێك بوترێ کەبۆنی سەلماندنی هەبوونی خوای لێ بکرێ.

مارکسیەکان وادەزانن کەوا یاسای پاراستنی مادده (راستتر: پاراستنی وزە) بەڵگەیە لەسەر ئەوەی مادده ئەزەلی یە(٢٤) بەڵام یاوزە پارێزراو بێ و یاکەم نەفەوتێ؟ ئێمەش دەتوانین بڵێین کەخوا ماددەی وادروستکردووە کەبۆ هەتا هەتا بمێنێتەوە بەڵام چونکە

---

٢٠- ٢١- هەمان سەرچاوە.

٢٢- ف. ئەنگلز، ضد دوهرنگ، ل٧١

٢٣- هەمان سەرچاوە، ل٧٠.

٢٤- بۆلیتزستنیەو یاخوت (؟)، عرض موجز للمادية الديالكتيكية، ل٥٠.

خوا دروستی کردووه کەواتە سەرەتای هەیەو ئەزەلی نی یە.(٢٥)

بەلاَم هێشتا پاسای پاراستنی وزە کەڵکی نی یە بۆ مارکسی یەکان چونکە ماددە بەشێکی یەکجار بچووکە لەچاو بۆشایی ی گەردوون بۆیە وزە بەتەواوەتی پەرش و بلاَو دەبێ. جاڵەگەر ماددە بێ سەرەتا بووایە دەبوایە دەمێك بوو وزە پەرش و بلاَوبوایەو ئەم گەردوونەش کەتیایدا دەژین دەمێك بوو دەفەوتا.(٢٦)

جابۆ ئەوەی وزە لەناو بۆشاییە بێ کۆتایی یەکەی گەردووندا پەرش و بلاَو نەبێتەوەو بۆ ئەوەی بتوانێ پاش هەموو بلاَوبوونەوەیەکی وزە ئەم وزەیە دیسان کۆبکرێتەوەو گەردونێکی نوێ دروست بێ... دەبێ گەردوون و ماددەکەی بێ سنوورو بێ کۆتایی بێ و گەردوون و ماددە «پەلەپەڵ لەناو بۆشایی یەکی بێ سنووردا» نەبێ بەڵکو ماددە بێ سنوور بێ و بەهەر لایەکدا بڕۆین هەر ماددە بێ و چەند بڕۆین کۆتایی ی ماددە نەیەت.

بەقسەیەکی تریش: مارکسی یەکان پاراستنی وزە بۆ سەلماندنی ئەزەلیەت بەکار دەهێنن بەلاَم پاراستنی وزە تەنها لەو حاڵەتەدا کەڵکی هەیە کەگەردوون و ماددەو وزە بێ سنوور بێ.. بەلاَم خۆ ئەمەش سەلماندنی دەوێت چۆن دەیسەلمێنن؟ باخۆمان بەو قوتابیانە بزانین کەکتێبەکەی (عرض موجز للمادية الديالكتية) یان بۆ نووسراوەو بزانین چۆن بەڵگە دەهێنرێتەوە لەسەر بێ سنووری ی گەردوون.

دوو نووسەرەکە بەڵگەی ئەوە دەهێننەوە گوایە ئەگەر موشەکێك لەسەعاتێکدا پێنجا هەزار کیلۆمەتر ببڕێ ئەوا پاش هەزارەها ملیار ساڵ دەگاتە ئەو ئەستێرانەی کەیەك ملیار ساڵی تیشکی ێمان دوورن(٢٧) هەروەها «بەڵگەیەکی تر» دەهێننەوە گوایە مەجەرەکەمان (١٥) ملیار ئەستێرەی تێدایەو ملیۆنەها مەجەرەی وەکو ئەو هەیە لەگەردووندا کەواتە گەردوون بێ سنوورو کۆتایی یە(٢٨)

جاڵەگەر دوو نووسەرەکە بەوپەڕی قەناعەتەوە ئەمەیان وتبێ ئەوا عەقڵیان وەکو عەقڵی ماسی یەکی ئۆقیانوسە کەوا دەزانێ ئۆقیانوس بێ کۆتایی یە لەبەر ئەوەشی کەبێ کۆتایی یە کەواتە ئەزەلی یە.

---

٢٥- ئەمە ئەگەر پاساکە هەمیشە راست بێت، بەلاَم لەراستی دا پاساکە لەهەموو حاڵەتێکدا راست نی یە، بڕوانە: د. احمد سيد النواوي، التركيب الدقيق للذرة، ل٥٦.

٢٦- ئەنانەت ئەمەش راست نی یە چونکە وشەی (دەمێکە) بۆ شتێك بەکار دێت کە سەرەتای هەبێ و لەگەڵ ئەزەلیەت دا ناگونجێ بەلاَم ئێمە وەکو (حالاتيانه) قسەی سەرەوەمان وتووە.

٢٧- عرض موجز للمادية الديالكتيكية، ل٥١. ئەم «بەڵگەیە» کەدووره لەسەر یەشە لەسەرچاوەی تریش دا هەیە بڕوانە: مهدي اللنجاب گۆڤاری الثقافة، ژمارە٦، ١٩٧٨/٦، ل١١٦

٢٨- عرض موجز...، ل٥١.

وتمان ئەگەر گەردوون بێ سنوورو کۆتایی بێ کەواتە ئەزەلی بەڤی ماددە راستە، مارکسیەکان وابیردەکەنەوە بۆیە سوورن لەسەر بێ سنووری گەردوون، هەندێك جاریش پێویست بەمونالەشە ناکات و ئەمە وەکو راستیەکی زانستی باسی دەکرێ(٢٩)و هەندێك جاری تریش بەئاشکرایی رای دەگەیەن: «بەپێی تیۆرە کەمان (مارکسیەت؟)... گەردوون هەمیشە بێ سنوور بووە» وەکو سەرۆکی زانکۆی مۆسکۆ دەڵێ(٣٠).... ئەمە بەپێی تیۆرە فەلسەفیەکەیان، تیۆرە زانستیەکەش کەدەڵێ گەردوون بەسنوورە (مۆدێلی گەردونی فراوانبوو) گرنگ نیە، گرنگ «تیۆرەکەمانە» بێ گومان بەفەرمانی لیژنەی مەرکەزی یەکێتی سۆڤێتی ئەوسا.

## ٢- پێناسەی ماددیەت:

پێناسە سەیرەکەی: (لینین) بەکورتی دەهێنینەوە کەدەڵێ ماددیەت ئەوەیە کەدان بەوەدا بنێین کەوا ماددە لەدەرەوەی ئێمەیەو کار لەهەستەکانمان دەکات نەك هەستەکانمان کاری تێدەکەن... ئەمەش پێناسەیەکی مەعریفی (ئەپستمۆلۆجی)یە(٣١) ئەگەر وابێ «ئایدیارەکانیش» ماددین، بەڵکو لەلینینیش ماددیترن چونکە «ئایدیارەکە» (ضمان)ی هەیە کەماددە (موضوعي)یەو بەرهەمی بیرمان نیە (ضمان)ەکەش «ئاینەکە» خۆیەتی کەماددە وەك شتێکی واقیعی باس دەکات بەڵام دەبێ لینین چ (ضمان)ێکی هەبێ؟ وەکو (سارتر)ی وجودیش دەڵێ -دەشزانین کەسارتر بێ باوەڕ بوو-: مرۆڤ ناتوانێ «لەخۆی دەربچێ» تاپزانێ مەسەلەکە وایە یان نە،(٣٢) واتە بزانێ ماددە واقیعیە یان هەستەکانمان هەڵمان دەخەڵەتێنن.

## ٣- دروست بوونی ژیان

ماددەی مردوو لای مارکسیەت سەرچاوەی ژیانە، لای ئینگلزیش ئەگەر کیمیازانەکان ئەلبومین دروست بکەن، ئەو ئەلبومینە «هەر دەبێ دیاردەکانی ژیان پیشان بدات چەندیش ئەو دیاردانە لاوازبن»(٣٣)

ئەم «دەبێ»یەش لەزانستەوە دەستی نەکەوتوە (ئەو زانستەی کەتائەمڕۆ نهێنی ژیان نازانێ) بەڵکو لەقەناعەتەکەی خۆیەوە دەستی کەوتووە، بازانستیش بچێتە ئەو لاوە چونکە قەناعەتەکەی خۆی گرنگترە!

---

٢٩- بۆ نموونە بڕوانە: نخبة من العلماء والاكاديميين السوفياتيين، الموسوعة الفلسفية، ل٢٢.

٣٠- بڕوانە بەشی زانستی لەگۆڤاری (الف باء)دا، ژمارە ٢٤-١، ١٩٨٩/٥/١١، ل٣٣.

٣١- جان -ئیف کالڤێز، فكر كارل ماركس، بەرگی دووەم، ل٣٧.

٣٢- جان - پۆل سارتر، المادية والثورة، ل٤٣.

٣٣- ئینگلز، ضد دوهرنگ، ل١٢٧ هەروەها: ئینگلز، نصوص مختارة (لەهەمان سەرچاوەوە) ل١٠١. ئەلبومین سپێنەی هێلکە دەگرێتەوە.

لەمــە خــراپــتر ئــەوەیــە مــارکــسی یــەکی ســەدەی بیــست دەڵێ: «... چالاکی یە کیمیایی یەکان لەبارودۆخێکی دیاری کراودا دەبنە هۆی پەیدابوونی ژیانی ئۆرگانی»(٣٤) کەی و چۆن و لەکوێ و کێ وتی؟ مەگەر خوا بزانێ.

ئەمجارەش گوێ ی لێ بگرن: «زانستە سروشتی یەکان ژمارەیەکی زۆری راستی (سەرنج بدەنە وشەی: راستی) سەبارەت بەوەی کەسروشتی زیندوو (الطبیعة الحیة) لەسروشتی مردووی نائۆرگانی یەوە درووست بووە»(٣٥) لەهەمان لاپەرەشدا لەبارەی دروستبوونی زیندەوەرێك لەماددەوە دەڵێ: «زانست (فرض) دەکات....»(٣٦).

سەرنجتان دا؟! لەلایەك مەسەلەکە وەکو (راستی) باس دەکات و لەلایەك وەکو (فرض)و (گریمانە)و (لەوانەیە)و (رەنگە)

گرنگ نی یە! باپڵێین چاومان کوێر بوو لەئاست ئەم فرتو فێڵە... خۆ ئەگەر ماددەی زیندوو لەماددەی مردووەوە دروستبوون ئەمە چ بیرێکی ماددی دەسەلمێنێ و چ ئاینێکی ئاسمانی پووچەڵ دەکاتەوە؟ ئێمەش بڕوامان بەوە هەیە بەڵام ئێمەش و هەموو کەسێکیش دەزانین کەوا هێشتا نهێنی ی ژیان هەر نهێنی یە.

«بەڵگە»یەکی تری مارکسی یەکان تیۆری (داروین)ە. تیۆرەکە باسێکی دوورو درێژی دەوێ بەڵام لەم چەند خاڵەدا حەقیقەتی ئەم «بەڵگە»یە ئاشکرا دەکەین:

١- تیۆرەکە لێڕێکی زانستی نی یە بەڵکو تەنها (احتمال)ە واتە دەچێتە خانەی (گریمان)و (رەنگە)و (لەوانەیە) ئەمەش جگە لەوەی کەمەسەلەی سیاسی ی تێ دا تێکەڵ کراوەو بۆ باپەتی غەیری زانستی بەکار دێت.

٢- بەڵام باپڵێین تیۆرەکە راستە.. ئەو کاتە تیۆرەکە دەبێتە بەڵگە لەسەر هەبوونی دروستکارێك چونکە پێویستە چالاکی یەکانی دروست بوونی ژیان و گەشەسەندنی ئەوەندە خێرا رووبدەن کەچاوەڕێ ی رێکەوت نەکرێ (رێکەوتیش = فوضى)و دەبێ دەستێکی رێکخەری لەدواوە بێ.

بەپێ ی تیۆری (احتمالات) پێویستە دە توان چل هەزار جار (واتە: ژمارەیەك کە چل هەزار سفری لەبەردەمە) هەوڵ بدرێ تاجارێك ترشە ئەمینی یەکانی زیندەوەرێکی تاکە خانە (واتە ئەوەندە ساکارە کەلەیەك خانە پێکهاتووە) بەشێوە راستەکە رێك بێ(٣٧) ئەی

---

٣٤- ئافاناسییف، اسس الفلسفة الماركسية، ل٤١.

٣٥- ٣٦- ئافاناسییف ل ٥٢ بەهەمان شێوە ماددی یەکانی سەدەی نۆزدە سووربوون لەسەر باوەڕی (دروست بوونی خۆیی) ئەویش کە دەیانبینی کەکرم لەبۆگەن بوونی لاشەی مردوو دروست دەبێ.. (لویس پاستیر) بەتاڵی کردنەوە هەڵەی ئەم باوەڕەی دەرخست بەڵام هەندێکیان هەر سوور بوون لەسەری بڕوانە: کیمیاء الحیاة وظیفیاتها، ل٢٥.

٣٧- بڕوانە گۆڤاری الثقافة ٢/١٩٨٢، ل٧٧ بەدواوە

بۆ دروستبوونی زیندەوەری دووەم و سێیەم و چوارەم؟ ئەی بۆ دروستبوونی زیندەوەرێکی ئاڵۆزتر؟ ئەی ئائەم زیندەوەرە دروست دەبێ چەند ساڵان پێویستە؟ تەمەنی گەردوون تەنێکی (١٥) هەزار ملیۆن ساڵە بەڵام ماوەی پێویست بۆ دروست بوونی ئەم (جەنابە) ژمارەیەکی خەیاڵی یەکەناوترێ.

تازیندەوەرێکی ساکاری خەیاڵی دروست دەبێ پێویستە ماوەی دە توان (١١٩٧٠١) ساڵ تێپەرێ (دوای خاترانەی زۆر!)(٣٨) واتە ژمارەی یەك کە (١١٩٧٠١) سفری لەبەردەمە لەکاتێکدا تەمەنی گەردوون ژمارە (یەك و نیو) و (٩) سفری لەبەردەمە!!

دیارە کەئەو (جەنابە) زۆر عاقڵترە لەو کەسانەی کەئەو هەموو ژمارانە دەبینن بەڵام هەر دەڵێن: رێکەوت دروستکەرمانە.. ئەم قسەیەتان لاسەیر نەبێ چونکە خوا خۆی وەسفیان دەکات: ﴿إن هم الا کالانعام بل هم أضل سبيلا﴾ الفرقان/٤٤. واتە: وەکو ولاخ وان بەڵکو گومڕاتریشن.

وەسفەکە پڕ بەپێستی خۆیانە ئەگینا چۆن کەسێکە ئەو کەسەی کەلەجیاتی خوایەکی تاك و تەنیا چەند خوایەکی کوێرو شێت و بێ عەقڵی بۆ خۆی هەڵبژاردووە وەکو سروشت و رێکەوت....؟

## ٤- «زانستێتی»ی دیالێکتیك:

مەنهەجی دیالێکتیکی مەنهەجێکی زانستییەو دەستکەوتەکانی زانست پشتگیری دەکەن... مارکسیەت (پێشتریش هێگل) وادەڵێ.

جارێ باالەوە بڵێین کەوا چەندین کەس رەخنەیان لەهێگل گرتبوو کەدیالێکتیکی بردبووە جیهانی (سروشت) لەجیاتی ئەوەی کەلەجیهانی (بیر)دا بیبینێتەوە، هێگل ئەو عەیبەی پێنەکرد بەڵام ئێنگلز بەبێ ئەوەی کەپێنەی هەبێ شوێنی هێگل کەوت و خۆی تووشی رەخنەکرد تەنانەت لەلایەن هەندێك مارکسیشەوە، بۆ نموونە هنری لوفێڤر H.Lefebvre کەلەو بڕوایەدا بوو کەدیالێکتیك تەنها لە(بیر) دا هەیە نەك سروشت(٣٩) هەروەها مارکسیی هەنگاری جۆرج لوکاش (G.Lukacs(؟ کەدەڵێ کەوا ئێنگلز بەهەڵە شوێنی هێگل کەوتبوو لەچەسپاندنی مەنهەجی دیالێکتیکی بەسەر سروشتدا(٤٠) مارکسی بەکاتیش هێرشیان بردە سەری (هەروەها سەر (لوفێڤر)..) ناوای لێ هات لەم باوەڕە پاشگەزبێتەوەو حاشای لێ بکات(٤١). کۆنە کۆمۆنیستی یۆگۆسلاڤیش

---

٣٨- شمس الدين آق بلوت، داروين ونظرية التطور، ل٥١. بەزمانی کوردیش: ئایا راستە تیۆری داروین هەرەسی هێناوە، ل٦١.

٣٩- د. امام عبدالفتاح امام، خرافة الجدل في الطبيعة، الفصول الاربعة/ ٧، ل٨٤.

٤٠- هەمان سەرچاوە، ل٨٥.

٤١- هەمان سەرچاوە ل٨٤.

میلۆڤان جیلاس(؟) لەکۆبوونەوەیەکدا ساڵی (١٩٥٤) بەرامبەر (تیتۆ)و دەستەو دایەرەی ووتبووی کەوا زانستی نوێ پشتگیری ی دیالێکتیکی سروشت ناکات لەئەنجامیشدا لەلیژنەی مەرکەزی دەرکرا(٤٢) هەر خۆشی دەڵێ کەوا زەحمەتە لەمێژووی بیری مرۆڤایەتیدا شتێکی هیچو پووچتر لەباوەڕی مارکسیەت سەبارەت بەدیالێکتیکی سروشت بدۆزینەوە(٤٣).

بەلام بازانین کەوا تاوانەکە هەر هی ئێنگلز نەبووە بەتەنیا بەڵکو مارکسیش بەشدارە لەم گوناهە چونکە لەنامەکانی ساڵانی (١٨٦٣-١٨٧٤)ی نێوان مارکس و ئێنگلزدا مارکس لەمەدا پشتگیری لەبرادەرەکەی دەکرد(٤٤).

بەهەرحاڵ مارکسیەکان ناتوانن مارکسیەت لە(دیالێکتیکی سروشت) رزگار بکەن و (دیالێکتیکی سروشت) فڕێ بدەنە دەریا چونکە:

١- مارکس ئەمەی بەدڵ بوو.

٢- ئێنگلز هاوڕێ ی و پارمەتیدەری بوو (لەپلەدا) بۆیە ئەم کارە «خیانەتە» لەمارکس خۆی.

٣- لەهەمووشی گرنگتر لابردنی (دیالێکتیکی سروشت) واتای ئەوە دەدات کەمارکسیەت (شمولیە) تەکەی نامێنێ، بەلام مارکسیەکان وایان بڕوایە کەمارکسیەت (شمولیە)و بیروسروشت و زەوی و ئاسمان و دارو بەرد دەگرێتەوە.

گرنگیش نیە ئەگەر دیالێکتیکی سروشت هەڵەبێ! قەید ناکات. ئێنگلز پەلەی کرد هیچی تر(٤٥). تازە عەیبیشە حاشای لێ بکرێ.

ئەمەش سەبارەت بەوەی کە(دیالێکتیکی سروشت) شتێکی زانستی نیە بەلام (سارتر) زۆر بەکورتی باسی ئەوە دەکات کەهەموو دیالێکتیک (نەك هەر دیالێکتیك لەناو سروشتدا) پێچەوانەی زانستە، بەپێی سارتر مەنهەجی زانستی لە(عینی)یەوە دەچێ بۆ یەقی (یان بابڵێین: لەبەرجەستەوە بۆ رووت) ئەمەش پێچەوانەی دیالێکتیکە کەلەیەقیەوە دەچێ بۆ (عینی)(٤٦).

---

٤٢- م. جیلاس، مجتمع غیر کامل، ل٧٠..

٤٣- هەمان سەرچاوە، ل٧٢-٧٣.

٤٤- ر. گارۆدی، کارل مارکس، ل١٢٤.

٤٥- نموونەی پەلەپەلی ئێنگلز (فرانتز میرنگ)ی مارکسی ی هاوچەرخی باسی دەکات. ئێنگلز بۆ مارکس دەنووسێ: «وەکو من بکە؛ کاتێك دەست نیشان بکە بۆ تەواو کردنی کارەکەت و بەزووترین کات لە چاپی بدە» (میرنگ، کارل مارکس حیاتە....، ل٩٢) هەروەها دەڵێ: «بەهەرحاڵ زۆرچاك لای خەڵك دەبێ (واتە بەرهەمەکەی) گرنگ ئەوەیە زوو تەواوی بکەی و بڵاوی بکەیتەوە، سەبارەت بەخاڵە لاوازەکانیش کەبەدی یان دەکەی؛ چی رووبدات گوێ دوژمنەکان دەریکی پێ ناکەن» ل١٨٨ ئێنگلزیش نەیزانی کەوا سەدو یەك گوێ دوژن بەرو چاوەکەیان دەکەنە چوار چاو نەك هەر خاڵە لاوازەکان بەڵکو ئەوانەش کەلای ئەو بەهێزن دەدۆزنەوەو دەیاندەنە بەر تیری رەخنە.

٤٦- سارتر، المادیة والثورة، ل١٩.

واتە زانست لەچەند دیاردەیەکی بەرجەستە دەکۆڵێتەوەو دەیانکاتە یاسایەک بۆ نموونە: بەرد دەکەوێتە خوارەوە (بەرجەستە) سەی یاسای (اجاذبیة) (رووت)، بەڵام دیالێکتیک (بەتایبەتی لای هیگل) لەموتەکانەوە دەست پێ دەکات (کەچەند شتێکی رووتن)و ووردە ووردە دەوڵەمەند دەبێ و بەرجەستەتر دەبێ (سروشت، ئاین، فەلسەفە، دەوڵەت).

ئێستاش بەشێوەیەکی عەمەلی تر ناڕاستێتی ی دیالێکتیک روون دەکەینەوەو باسی یاساکانی دیالێکتیک دەکەین کەلەڕاستی دا یاسا نین بەڵکو چەند قسەیەکن و وەسفی چالاکی یەک دەکەن هیچی تر.

**ا) «یاسا» ی دژەکان**

ئێنگلز نموونەیەکان بۆ دەهێنێتەوە کەلەهیگلەوە وەری گرتبوو پلێخانۆف ئەوەندە دڵی پێی خۆشە کەدەڵێ کەوا کەلەبەرەترین دوژمنی دیالێکتیک ناتوانێ دان بەڕاستی یەکەی نەنێ(٤٧).

نموونەکە ئەو شتەیە کەدەجوولێ: ئەو شتە لەکاتێکی دیاری کراودا لەشوێنێکی دیاری کراودا دەبێ (باڵێین خاڵی آ) بەڵام لەهەمان کات دا لەشوێنێکی تردایە (خاڵی ب)، ئەمەش (تناقض)ە (تناقض)ە کەش لادەچێ... بەردەوام بوونی درووستبوونی (تناقض)ە کەو لاچوونی جووڵە دروست دەکات(٤٨).

ئەوەی کەلەم نموونەیەدا بەدی دەکرێ ئەوەیە کە(کات) لە(شوێن) جیاکراوەتەوە چونکە شتەکە لەیەک کات دا لەدوو شوێن دەبێ، ئەمەش بۆچوونێکی زانستی نی یە چونکە:

١- خێرایی بەیەکەی (شوێن لەسەر کات) دەپێورێ واتە: کیلۆمەتر لەسەر سەعات، مەتر لەسەر چرکە.... کەواتە کاتێک شتەکە لەشوێنێکدا دەبێ ئەوا لەکاتێکی دیاری کرلودا تیای دا دەبێ و کەشوێنەکەی گۆڕی کاتەکەش دەگۆڕێ. بەم جۆرە ئەو «قسە فەلسەفی یە ناڕێکە لەگەڵ (حساباتی) زانست.

٢- (تیۆری نیسبی) کات و شوێن جیاناکاتەوە بۆ دووشتی جیاواز بەڵکو هەردووکیان لەیەکێتی یەک دان کە(ماوە)ی پێ دەوترێ (الفترة الزمانیة المکانیة)Interval. کەواتە «قسە» فەلسەفی یەکە لەگەڵ تیۆری نیسبیش دا ناڕێکە ئەویش کەتیۆرێکی زانستی یە نەک تەنیا «قسە».

بەڵام ئەم بۆچوونەی مارکسیەت (پێش ئەویش هیگل) بۆ جووڵە نەک هەر زانستی نی یە بەڵکو دژ بەدیالێکتیکیشە.

---

٤٧- پلیخانوف، المشاکل الاساسیة في الماركسیة، ل١١٢.

٤٨- ئینگلس، ضد دوهرنغ، ل٢٠٢.

هیگل ومارکسیەت دەیانەوێ بیڵێن کەپەیدابوون و لاچوونی (تناقض) چالاکیەکی دیالێکتیکیە بەڵام هەتا ئەگەر ئەم (تناقض)ەش هەبێ ئەوا چالاکیەکە (میتافیزیکی)یە چونکە (وەك بینیمان) جیاکردنەوەی (شوێن) لە(کات)ای تێدایە. ئەم جۆرە جیاکردنەوانەش کاری مەنهەجی میتافیزیکیە وەك هیگل و مارکسیەت دەڵێن.

نموونەکانی تری ئینگلزیش هەر لەم بابەتەن وەکو نموونەی (لەشی زیندوو) کەلە کاتێکی دیاری کراودا «خۆیەتی»و لەهەمان کاتدا «خۆی نی یە» کاتێکیش ئەم (تناقض)ە نەمێنێ لەشەکە دەمرێ(٤٩).

نموونەی تر لەبارەی (تیشك)ەوەیە کەسەرچاوەیەکی مارکسی دەڵێ: (تەنها لەسەدەی بیستەمدا سەلمێنرا کەوا تیشك شێوەیەکی (متناقض)ی هەیە لەبەر ئەوەی بریتیە لەتەنۆلکەو لەهەمان کاتیش دا بریتیە لەشەپۆل)(٥٠).

ئێمەش دەڵێین:

تەنها لای مارکسیەکان تەنۆلکە دژی شەپۆلە ئەگینا لەراستی دا تەنۆلکە «شتێکە»و شەپۆل «شتێکی تر»ە. سەرچاوەی ئەم سەرلێشێوانەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کەئەو کاتە دوو تیۆری فیزیایی لەبارەی تیشکەوە هەبوون: یەکێکیان دەیوت تیشك لەتەنۆلکە پێك دێت و ئەوەی تر دەیوت لەشەپۆل پێك دێت.

جائەنانەت بەبڕوای ئێمەش ئەم دوو تیۆرە (متناقض) نین. کەچی ئەمەش بووە (تناقض)ێکی راستەقینە لای مارکسیەکان کەیەکێکیان قسەی زانای فیزیایی (ماکس پلانك) دەهێنێتەوە: «یەکێکیان دژی ئەوەی تر.... وەکو دوو جەنگاوەری هاوهێز کەهەردووکیان بڕ چەکن»(٥١)

هەڵبەتە ماکس پلانك مەبەستی ئەوەیە دوو تیۆرەکە وەکو جەنگاوەر دژی یەکتر وەستاون نەك وەکو دژێکی دیالێکتیکی.

مارکسیەکانیش بەم دژایەتیە وەهمیە نەوەستان بەڵکو «دژایەتی»یەکەیان لەمەیدانی تیۆرەکەوە دەرکردو خستیانە مەیدانی ماددە خۆی گوایە (تەنۆلکە) دژی (شەپۆل)ە. کەواتە تۆش بەردێك فڕێ بدەرە گۆمێك و کەشەپۆلی ئاوت بینی ئەو کاتە بڵێ بە ئاوەکان (=تەنۆلکەکان) دژی شەپۆلی ئاوەکان.. بەڵام ئایا شتی وادەڵێ ی؟

راستتریش ئەوەیە بوترێ کەوا دوو تایبەتیەکەی تیشك (تەنۆلکەیی و شەپۆلی) دوو تایبەتی تەواوکەری یەکترن(٥٢) بەڵام مارکسیەت حەزی لە

---

٤٩- ضد دوهرنغ، ل١٣٧و ٢٠٢.

٥٠- ئافاناسییێف، اسس الفلسفة الماركسية، ل٧٠.

51- M.E.Omelyanovsky, Dialectics in Modern Physics, p.15f.

٥٢- د. احمد سعيد الدواري، التركيب الدقيق للذرة، ل٥٨-٥٩.

(ئەولوکەرێتی لەمەیدانی زانست و سروشتدا نییە چونکە لەمەیدانی کۆمەڵگاو چینەکاندا حەزی لێ نییە بەڵکو حەزی لەململانەیە.. هەموو شتێکیش لەپێناوی ململانەی چینەکانەو هەموو شتێك دەبێ بەدەوری ئەم ململانەیە بسوڕێتەوە.

دەڵێین کەوا ململانە رۆڵێکی گەورە لەکۆمەڵگادا دەبینێ بەڵام مارکسیەت دەیویست بیکاتە یاسایەکی رەها هەروەها سووربوو لەسەر ئەوەی کەلەم ململانەیەدا دوو دژ هەیە دەبێ یەکێکیان سەرکەوێ ئەویش بۆ ئەوەی تەفسیرێکی زانستی بداتە ململانەی چینەکانو پاشان سەرکەوتنی پرۆلیتاریا هەروەها بڵێ کەئەم ململانەیە لەهەموو گەردووندا هەیەو بەم جۆرە مارکسیەت فەلسەفەیەکە هەموو گەردوون دەگرێتەوە.

### ب) گۆڕانی چەندو گۆڕانی چۆن

دیالێکتیك هەردوو لایەنی چەند (الکمیة)و چۆن (النوعیة) وەردەگرێو گەڕاندنەوەی (چۆن) بۆ (چەند) بەکارێکی (میتافیزیکی) دەزانێ(٥٣) مارکس خۆشی لەکتێبی (سەرمایە)دا رەخنەی لەو ئابووری ناسە بۆرجوازییانە گرتووە کە تەنیا لایەنی (چەند)یان وەرگرتووە کاتێ لێکۆڵینەوەیان لەبارەی بەها (القیمة)وە (٥٤)

بەڵام ئایا (چۆن) زانستییە؟ زانستەکانی سروشت وەکو کیمیاو فیزیا.. هتد. لە(چۆن) ناکۆڵنەوە. (خەڵوز)و (گرافایت)و (ئەڵماس) سێ جۆرێتیی جیاوازن هەرچەندە هەرسێکیان (کاربۆن)ن جیاوازیش لەنێوان سێ ماددەکەدا بەهۆی چەند شتێکەوەیە: پێکبەستەکانی نێوان ئەتۆمەکان (کەچەندە)، گۆشەی نێوان ئەتۆمەکان (بەپلە)، دووریی نێوانیان (بەئەنگستروم) هێزی نێوانیان (بەجوول)... کەواتە بەرەو کوێ بچین هەر (چەند)مان دێتە بەردەم بەڵام (چۆن) شتێکە کەلەم مەیدانەدا رۆڵی ئاسایی بایەخی پێ دەدات.

لەنموونەی (کوڵانی ئاو)یش دا ئەو (چۆن)ـەی کەئێنگلز باسی دەکات (واتە: دروستبوونی هەڵم) لەراستی (چەند)ە بەو شێوەیەی کەلەسەرەوەدا باسمان کرد وەکو (سارتر)یش دەڵێ: زانا لێرەدا گوێ دەداتە (چەند) کەپلەی گەرماو پلەپەستۆی هەڵمو هەوایە. نەك (چۆن) وەکو کوڵانو هەڵم..(٥٥).

رەنگە زانستە مرۆڤایەتییەکان (العلوم الانسانیة) وەکو: کۆمەڵناسی، دەروونناسی..هتد (لەهەمووشیان زیاتر دەروونناسی).. (چۆن) رۆڵێکی گەورەیان تێدا بینێ بەڵام باشەوەش بزانین کەئەوەندەی زانستە سروشتییەکان -کەزانستی (چەند)ین- ورد نینو زیاتر قابیلی هەڵەن. بەهەرحاڵ هەتا ئەگەر ئەوەندەی زانستە سروشتییەکانیش وردبن ئەوا زانینیان کەوا بەشێکی گەورەی زانست -ئەگەر هەمووی نەبێ- مل کەچ

---

٥٣- الموسوعة الفلسفیة، ل٤٠١.

٥٤- کارل مارکس، راس المال، ج١، قسم١، ل٦١ پەراوێز.

٥٥- سارتر، المادیة والثورة، ل٤٧-٤٨.

ناکات بۆ (چۆن)، بەم شێوەیەش «زانستێتی»ی «یاسا»ی چەندو چۆن لەبناغەوە درزی تێ دەکەوێ.

مارکسیەتیش ئەنانەت لەزانستە کۆمەڵایەتیەکانیش دا کەبواری (چۆن)یان تێدا هەیە سەرکەوتوو نییە لەچەسپاندنی «یاسا»کەی. نموونە باشەکەشیان لێرەدا ئەمەیە: ژمارەی پرۆلیتاریا زیادەبێ (=چەندێ) دوایی بەبازێك (=شۆڕش) گۆڕانێکی (چۆنی) ڕوودەدات ئەویش نەمانی بۆرجوازیەت و بەدی هێنانی سۆشیالیزم. جائەگەر ئەمە لەم نموونەیەدا ڕاست بێ ئەی بۆچی لەگۆڕانی کۆیلایەتی و لەگۆڕانی دەرەبەگایەتی «یاسا»کە نەکەوتە کار..؟

ج) «یاسا»ی نەفی ی نەفی

ئەم «یاسا»یەش تەنها وەسفێکی کەم و کورتی چەند چالاکیەکە کەلەسروشت و زانست و مێژوودا ڕوودەدەن ئەگینا «یاسا»یەکی زانستی نییە بەو واتایەی زانست کەمارکسیەت مەبەستێتی.

ئەو دەنکە جۆیەی کەئینگلز لەهێگلی وەرگرت و وەکو ئەو چاندی و گوڵە جۆکەی دایە... ئەو دەنکە جۆیە کەرەسەی فێڵێکە. ئەگەر بڵێین کەوا ڕووەکە سەوزەکە دەنکە جۆکەی نەفی ی کرد ئەی گوڵە جۆکە چۆن نەفی ی ڕووەکەکە دەکات؟ ئایا هەر پێکەوە نابێ و بەیەکەوە وشك نابنەوە؟

دیارە ئاژەڵێکی کاخۆر بۆی هەیە بڵێ: ئەو کایەی دەیخۆم نەفی ی نەفی ی توێکڵی ئەو جۆیە کەمرۆڤە کە چاندی! ئەی بۆ نا؟ بۆچی لەبەرەکەتی نەفی ی نەفی بێ بەش بێ؟

ئەمە جۆ! ئەی دەنکە تووی (بۆنموونە)؟ دارەتوو نەفی ی دەنکە تووەکە دەکات بەڵام کەدارەکە بەردەگرێ درەختەکە نەفی نابێ. بەڵکو هەموو ساڵێك توو بەرهەم دەهێنێ و ساڵ لەدوای ساڵ لەدی ئەستوورتر دەبێ. کاتێکیش لەمارکسیەکی وەك پلیخانۆڤ دەپرسین: ئەمە دەنکە جۆ، ئەی درەختەکان؟ پلیخانۆڤ هەم سەر، و ئەو سەرو ڕاوەڕێوی دەکات بۆ ئەوەی وەڵامی ڕەخنەکە بداتەوە(٥٦).

ئینگلز دێتە سەر ماتماتیك و نموونەیەك لەسەر یاساکە دەهێنێتەوەو دەڵێ (س) نەفی دەبێ و دەبێتە (-س) ئەوەیش نەفی دەبێ و دەبێتە (س) دووجا(٥٧) ئێمەش دەڵێین لەنەفی یەکەمدا (-١) بەکارهات بەڵام دووەم جار (-س)، جا:

١- دەبوایە دووەم جاریش (-١)ت بدایە لە (-س) ئەو کاتە هەر (س)ـە یەکەمەکەت دەست دەکەوتەوەو یاساکە هەڵە دەبوو.

---

٥٦- بڕوانە: پلیخانۆف، تطور النظرة الواحدية... ل٧٦ بەدواوە.

٥٧- ضد دوهرینغ، ل٢٢٩-٢٣٠. لەوەرگێڕانەکەدا هێمای (١) بەکارهاتووەو بۆ ئەوەی تێکەڵ بەژمارە (-١) نەبێ هێمای (س)مان بەکار هێناوە.

٢- ئایا ئەمەش خاتری تۆزێ! بەلام بەعنی چی ئەگەر بتەوێ (-س) نەفی بکەی لە(-س)ی دەدەی واتە لەخۆی دەدەی؟ ئەمە چۆن نەفی یەکە؟ ئەمە تەنها بۆ ئەوەی دوایی پێیان بڵێی: ئەوەتا (س) دووجامان دەست کەوت و سڵاو لە یاسای نەفیی نەفی؟ دیارە ئەم نموونەیەی بۆ «گوێ درێژەکان» هێناوەتەوە. بێ گومان ئێمە نین و دەشزانین ئەمانە کێن!

هێشتا ماوە! ئینگلز سەری لێ دەشێوێ کاتێك کەبیری دەکوێتەوە کەوا بەیەك هەنگاو بەپێی نەفیی نەفیی دەتوانین (س) دووجامان دەست بکەوێ ئەویش بەوەی (س) لەخۆی بدەین. بۆیە دەڵێ: «جیاوازی نیە نێوان ئەم دوو ئەنجامە چونکە نەفییە نەفی کراوە کە لەناو (س)ی دووجادایە»(٥٨). بەلام یالا(س) دووجا شی بکەینەوە: یان (س X س)مان دەست دەکەوێت یان (-س X -س) کەیەکێکیان دوو (موجب)ی تێدایەو ئەوەی تر دوو (سالب) ئەگەر قسەکەی راست بوایە دەبوایە ئەنجامی شیکردنەوەی (س) دووجا (س X -س) بوایە کەوا نیە.

ئینگلز نموونەیەکی تر دەهێنێتەوە بۆ «گوێ درێژەکان»و دەڵێ: «ئەندازەیەکی جەبری (تفاضل) دەکەین، پاشان پێچەوانەی ئەمە دەکەین واتە تەواوکاریەکەی وەردەگرین (تکامل) بەلام کەئەمەم کرد نەگەڕامەوە ئەو خاڵەی لێوەی دەستم پێ کرد»(٥٩).

ئینگلز هەر ئەوەندە دەڵێ بەلام لێرەدا هەموو قسەکانی ئەو وەردەگێڕین بۆ سەر زمانی جەبری:

س=ص

دس/دص = ١ داتاشراوەکەیان وەرگرت (تفاضل)

دس=دص جێیان گۆڕین

∫دس=∫دص تەواوکارییەکەی وەردەگرین و دەبێتە:

س=ص

کەواتا گەڕاینەوە خاڵی سەرەتا!(٦٠) جا یان ئینگلز لەم چالاکییە جەبرییەی -کە(١٥٠) ساڵ بەر لەوەی کتێبی (دژ بەدوورینگ) بنووسێ زانرابوو- تێ نەگەیشتبوو یان ئەم نموونەیەش هەروا بۆ «گوێ درێژەکان»!(٦١)

---

٥٨- ضد دوهرنغ، ٢٣٠.    ٥٩- ضد دوهرنغ، ل٢٣١.

٦٠- لێرەدا تێکڕای (تفاضل)و (تکامل) بۆ خوێنەران روون بکەینەوە و یا ئەم نموونەیە بۆ ئەوانەیانی شەشەمی ئامادەییان تەواو کردبێ.

٦١- بۆ ئەمانەتی زانستی: وشەی (گوێ درێژەکان) وەکو خۆی لە کتێبەکەی ئینگلزەوە دووبارە دەکەینەوە و لە ئاینەت ئەم وشەیەی بۆ خۆی و مارکسیش بەکاری دەهێنا (بەپێی فرانتز مێرینگ).

لە کۆتاییش دا نموونەیەکی خۆمان لەسەر ئەم «یاسایە» دەهێنینەوە کەلەگەڵی دا ڕێکە: ئێنگلز زیندووبوو (ئەمە بابەتەکەیە) ژیانی ئێنگلز نەفی دەبێ بەمردنو دەمرێ (ئەمەش نەفی یە) پاشان ئەم مردنە نەفی دەبێو ئێنگلز زیندوو دەبێتەوە (نەفی ی نەفی) بێ گومان هەر بەپێی «یاساکە» ئەم زیندووبوونەوەیە وەکو ژیانی یەکەم نی یە بەڵکو دەوڵەمەندترە چونکە ئیتر ئێنگلز هەتا هەتایە دەژی! لەکوێش دا دژی (لەدۆزەخ یان بەهەشت) ئێرە دا گرنگ نی یە بەڵکو گرنگ ئەوەیە یاساکەمان چەسپاند!.. بەڵام ئایا مارکسیەکان دان بەم ئەنجامە دەنێنو بڕوا بەزیندوو بوونەوە دەهێنن؟!

## دووەم: «دیالێکتیکێ»ی دیالێکتیک

قسەیەکی باوی ناو مارکسیەت هەیە کەگوایە هێگل دیالێکتیکی بەسەرەو خواری دانابوو مارکسیش راستی کردەوەو وای لێ کرد لەسەر پێ بوەستێ. ئەمە قسەی مارکسو ئێنگلزە بەڵام لەوە خراپتر نووسەرە حزبیە مارکسیەکان خەتێکیان هێنابوو بەسەر هێگلداو هیچیان بۆ نەهێشتبووەوە. ئینجا بابزانین مارکسو غەیری مارکس لەبارەی هێگلەوە چی دەڵێن: مارکس رەخنە لەو ملهوڕە خۆهەڵکێشەرانە دەگرێ کەهێگل وەکو «سەگێکی تۆپیو» تەماشا دەکەن بۆیە دەڵێ: (بێ پێچو پەنا وتم کەوا من قوتابییەکی هێگلم(٦٢). هەروەها: (فۆیەرباخ لاوازە ئەگەر لەگەڵ هێگلدا بە راورد بکرێ)(٦٣) بەمەرجێك فۆیەرباخ ماددی بووو کارێکی گەورەی کردبووە سەر مارکس.

ئێنگلزیش لە(دیالێکتیکی سروشت)دا دەڵێ کەوا کارەکانی هێگل زۆر لەهەموو هیچو پووچیە ماددیەکان مەزنترە(٦٤).

لینینیش کەلەمارکسو ئێنگلز حزبی تر بوو، ساڵی (١٩٢٢) باسێك لەگۆڤارێکدا بڵاودەکاتەوە کەدوایی باسەکە بە(وەسیەتی فەلسەفیی لینین) ناسراو پێشنیاری کردبوو کەبەشدارانی گۆڤارەکە (کۆمەڵەی هاوڕێیانی دیالێکتیکی هێگل) دابمەزرێنن(٦٥) پلیخانۆفیش هەروەها دان بەبایەخدانی هێگل بەواقیعو کاری لەسەر بیری کۆمەڵایەتی ی سەدەی نۆزدەهەمدا دەنێ.(٦٦)

---

٦٢- مارکس، رأس المال، ج١، القسم١، ل٢٧.

٦٣- مارکس، بؤس الفلسفة - الملحق.. نامە بۆ فۆن شفایتزەر ساڵی ١٨٦٥- ل١٩٧.

٦٤- امام عبدالفتاح امام، المنهج الجدلي... پاراگراف ٣٥٥.. بۆ قسەی تریش بڕوانە: گارۆدی، کارل مارکس، ل٥٠و د. زکریا ابراهیم، هیجل او... ل١٨.

٦٥- بونیفاتی کیدروف (؟) : الجدل منطق الماركسية، وەرگێڕانی الیاس مرقص، گۆڤاری: دراسات عربية ١٢/١٠/١٩٧٤، ل٧٠.

٦٦- پلیخانۆف، نقد نقادنا... ل٢٣١ هەروەها ل٢٢٦ هەروەها: تطور النظرة الواحدية... ل٦٩ بەدواوە قسەی خەڵکی تریشی هێناوە.

ئەمە بوو نرخی هێگل لای سەرانی مارکسیەت(٦٧) بەڵام مارکس خۆی سەری لەخوێنەرانی شێواندبوو کاتێك لە(سەرمایە)دا وتبووی گوایە مەنهەجەکەی خۆی لەهی هێگل جیاوازە(٦٨) بەڵام دەبێ مەبەستی ئەو لەم جیاوازییە ئەوە بێ کە(منهج)ەکەی (واتە چەسپاندنی مەنهەجەکە) جیاوازە. بەڵام کەمەنهەجەکەی هێگلو هەموو فەلسەفەکەشی خاڵی لاوازی زۆریان تێدایە (هەرچەندە وەکو بینایەکی مەحکەم خۆی پیشان دەدات) ئەی دەبێ مارکسیەت چۆن بێ کەلەم لاو لەو لا شتی کۆکردۆتەوەو فەلسەفەیەکی لێ دروست کردوون؟

سەرەتا ئەگەر مارکسیەت فیکرەیەکی دیالێکتیکی بوایە دەبوایە «یاساکانی» دیالێکتیك وابەرش‌و بڵاونەبونایەو بکرانایە یەك زنجیرە کەهەر یاسایەك بەوەی تر بەستراوێ وەك چۆن شتی واهەیە لەفەلسەفەی هێگلدا بەڵام ئێنگلز قایل نەبوو بەم کارە هەڵسێ(٦٩).

نموونەیەکی تری نادیالێکتیکیێتی ی «یاساکانی» دیالێکتیك‌و دیالێکتیك خۆی ئەوەیە کەواتای هەرە فراوانی دیالێکتیك بریتی یە لە(گۆڕان‌و بەرەو پێشەوەچوون) بەڵام ئەمە دیالێکتیك ناگرێتەوە. یەکێکی وەکو (پلێخانۆف)یش دان بەوەدا دەنێ کەدیالێکتیك گۆڕانی بۆ نی یە(٧٠). ئەمەش کەدژ بەدیالێکتیك خۆیەتی.

دێینە ئاستێکی خوارتر: ئەوەتا «یاسا»ی دژەکان کرۆکی دیالێکتیکە، (تناقض)یش لەهەموو شتێك‌دا هەیە، ئەی لەناو فەلسەفەی مارکسیەت خۆی‌دا؟ بۆچی دەبێ لەسەرووی ئەم «یاسا نەمرە» بێ؟

جاڵەگەر بێینە سەرباوەری (یەکەمێتی ماددە)و (دروست بوونی ژیان) دیالێکتیك نابینین بەڵکو تەنها بیروباوەڕێکی ماددی ی رووت. ئەگەر دیالێکتیکیش بەو شموولیەتەیە کەباس دەکرێ بۆچی لێرەدا خۆی دەشارێتەوەو کوا (دیالێکتیکێتی)یەکەی؟

---

٦٧- بەڵام دیارە ئەمە لەبەر ئەوەی کە هێگل مردبوو و (مفالس)ی ئەوان نەبوو ئەگینا هیچیان ئیعترافیان بەو کەسانە ناکەن کەهاوچەرخیانن ئەمەش دیارەیەکە زۆر دەبیندرێ: رێزگرتن لەمردووەکان و بەهیچ نەزانینی زیندووەکان چونکە زیندووەکان (منافس)ی زیندووەکانی ترن.

٦٨- بڕوانە: مارکس، رأس المال، ج١، القسم١، ل٢٢.

٦٩- ئەویش لەکتێبی (دیالێکتیکی سروشت)دا کەتەواوی نەکردبوو، بڕوانە: المنهج الجدلي پ٣٦٧.

٧٠- پلێخانۆف، تطور النظرة الواحدية.... ل٦٥ بەراورد.

# ئەنجام

بەر لەوەی بچینە سەر (مادديەتی مێژوویی) کەبەشی دووەمی مارکسیەتە دەڵێین کەوا ئەمانەمان بۆ دەرکەوت:

١- (ماددیيەت) بەواتای ئەوەی کە(ماددە) یەکەمە تەنها قسەیەو هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نییە. (ماددیيەت)یش بەواتای ئەوەی کە(ماددە) لەدەرەوەی هەستەکانمانە.. پێی ناوترێ ماددیيەت مەگەر لای مارکسیەکان.

٢- دروست بوونی ژیانیش بەبێ دروستکار هەروەها تەنها قسەیەکی بێ بەڵگەیە.

٣- چ لەباوەڕی ماددیيەت و چ لەبۆچوونی ماددی بۆ دروستبوونی ژیان دیالێکتیك نابینین ئیتر ئەمە چۆن ماددیيەتێکی دیالێکتیکییە؟

٤- «یاسا»کانی دیالێکتیك زانستی نین.

٥- «یاسا»کانی دیالێکتیك یاسا نین چونکە دەبوایە وەکو یاسا بەسەر هەموو شتێك و حاڵەتێکدا بچەسپانایە. بەڵام تەنانەت بەسەر ئەو نموونانەش ناچەسپێن کە کراونەتە بەڵگە بۆیان مەگەر بەزۆرانبازی.

٦- «یاساکانی» دیالێکتیك تەنانەت دیالێکتیکیش نین واتە: «یاساکانی» دیالێکتیك نەزانستین و نەدیالێکتیکین و نەیاساشن!

کەواتە چی دەمێنێتەوە لەماددیيەتی دیالێکتیکی؟ بائەوەها بپرسین: ماددیيەتی دیالێکتیکی چ دەستکەوتی زانستی و تەکنەلۆجی بەمرۆڤایەتی بەخشی؟ چەند زانا بەکاریان هێنا بۆ تاقی کردنەوەکانیان ؟

ئێمە تەنها یەك بەکارهێنانی دەزانین: چەواشەکردنی نیمچە خوێنەران. ئەوەندەش لەمارکسیەت و لەمارکسیەکان شارەزاین بەدڵنیاییەوە دەڵێین ٩٩٪ی مارکسیەکان لەم جۆرەن، چونکە ئەو ٩٩٪ یەئەوانەن کەهەڵگرانی دروشم و قسەی جوولاو، سەد جار دووبارە کراون.

جالێرەدا ماددیيەتی دیالێکتیکی بەخۆی و وشکییەکەیەوە جێ دەهێڵین و ژمارەیەکی تری رەخنە لەرەشنووسی ئەم کتێبە دەهێڵینەوە. هەوڵیشمان دابوو کەتابتوانین باسەکە ئاسان بکەینەوە بۆ ئەوەی خوێنەر باشتر لێی تێ بگات پێش هەموو خوێنەرێکیش خوێنەری مارکسی کە لەلاتاینەکەی خۆی زۆر شارەزا نییەو لەدروشمبازی و قسەی جوولاودا پلەی یەکەمی هێناوە (هەڵبەتە کەمێکیان نەبێ).

## سێیەم - ماددییەتی مێژوویی و زانست

لای مارکسییەکان (ماددیەتی مێژوویی)(71) تاکە تەفسیرێکی زانستی کۆمەڵگاو مێژووە. جا ئێمە لێرەدا لەم نیدیعایە دەکۆڵینەوەو رووڕی دەکەینەوە کەوا لەگەڵ زانستو واقیعدا ناگونجێ.

### ١- وجودی کۆمەڵایەتی و هۆشی کۆمەڵایەتی

بەرهەم هێنان (کەلای مارکسیەت سەرەکی ترین لایەنی وجودی کۆمەڵایەتییە) بووە هۆی پەیدا بوونی هۆش (وعي) لای مرۆڤی سەرەتایی، مارکسیەت ئەمە دەڵێ... بەلأم زەحمەتی پێچەوانەی ئەمە بوترێ و بڵێین کەوا مرۆڤ هۆشمەند بووئینجا توانی بەرهەم بهێنێ(72). ئەمەش بەردی بناغەی ماددیەتی مێژوویی هەڵدەگێڕێتەوە.

هەڵیشانە بپرسین: کەمرۆڤ هۆشمەند نەبووبێ چۆن دەستی کرد بەبەرهەم هێنان؟ زووش پلێخانۆف وەڵامی رەخنەیەکی وای دابووەوەو تیایدا سەری لێ شێوابوو قسەی (داروین)ی هێنابووەوە کەچۆن دەستی مرۆڤ «گونجان بۆ ئەوەی بەپێی خواستەکانی (الرادة) کاربکەن»(73) خواست؟ ئیرادە؟ ئەگەر مرۆڤ هۆشی نەبووبێ چۆن خواستی هەبووە؟

پلێخانۆف دوایی دەڵێ کەوا لەوانەیە (بڕوانە وشەی لەوانەیە) ئەم دوو دەستە بەهۆی هەندێك تایبەتی‌ی دەوروبەری جوگرافی ئەو شێوەیەیان وەرگرتبێ»(74) جابا ئەمە بڵێین:

یەکەم: مارکسیەکان (غەیری مارکسیەکانیش هەروا) کەرێیان لێ دەگیرێ پەنا دەبەنە بەر (لەوانەیە)و (رەنگەیە)و (دوور نییە).. کەچی بۆچوونەکەی خۆیان هەر بە «راسترین لێکدانەوە ...» دەزانن.

دووەم: کاری جوگرافیای دەورو بەر کەپلێخانۆف پەنای بۆ دەبات پەیوەندی بەبەرهەم هێنانەوە نییە کەماددیەتی مێژوویی تەئکیدی لەسەر دەکات.

سێیەم: وەك وتمان گونجانی دەستی «باپیرە مەیموونمان» بۆ ئەوەی بەپێی خواستەکانی کار بکەن ئەوە نیشان دەدات کە «باپیرە مەیموونمان» خواستی هەبووە (الرادة)، خواستیش پێویستی بەهۆش هەیە کەواتە هۆش سەرەتاو یەکەمە ئەمەش پێچەوانەی قسەکەی ماددیەتی مێژوویییە.

---

71- ئێمە ناوی (ماددیەتی مێژوویی) بەکار دەهێنین هەرچەندە بڕوامان بەوە نییە کە ئەو شتانەی کەماددیەتی مێژوویی باسیان دەکات پێی هیچ ئەبێت بەشێکیان ماددی بن، وەکو (کارل مانهایم)یش دەڵێ کەوا ماددیەتی مێژوویی تەنها بەناو ماددییە. بڕوانە: K.Mannheim, Ideology and Utopia, p.229

72- د. الیاس فرح، تطور الفکر الماركسي ل٢٩١.

73- بڕوانە: پلێخانۆف، تطور النظرة الواحدیة...، ل١٠٦. 74- هەمان سەرچاوە ل١٠٧.

پلێخانۆف دەیزانی کەوا ئامێر بەهۆی هۆشەوە دروست دەبێ بەڵام حەز دەکات کەهۆش بەهۆی ئامێرەوە دروست بووبێ بۆیە پەنا دەباتە بەر پەرستراوە کوێرە شێتەکەو قسەی کابرایەك دەهێنێتەوە کەگوایە ئامێرە یەکەمە هەرەگرنگەکان بەرێکەوت دۆزراونەوە.(٧٥).

بەواتایەکی تر پلێخانۆف ویستوویی خۆی لەو قوڕاوە رزگار بکات:

١- ئامێرو بەرهەمهێنان هۆشی مرۆڤیان دروست کرد (مارکسیەت وادەڵێ).

٢- بەڵام هۆش نەبێ نەئامێرو نەبەرهەم هێنان دەبێ (عاقڵەکان وادەڵێن).

کەواتە دەبێ ئامێرە یەکەمەکان بەهۆی رێکەوتەوە پەیدابووبن، ئەمانەش هۆشی مرۆڤیان دروست کرد، بەم جۆرەش پلێخانۆف خۆی لەو قوڕاوە رزگار دەکات، ئەوەش بەبەرەکەتی خوداوەند (رێکەوت)... پیرۆز بێ ناوت پەرستراوە کوێرە بێ عەقڵەکەی جاهیلیەت!

ئەمە سەبارەت بە پەیدا بوونی هۆشی مرۆڤی سەرەتایی، بۆ هۆشی مرۆڤی چەرخەکانی دوایش مارکسیەت دەڵێ گوایە باری کۆمەڵایەتی (بەتایبەتی بەرهەم هێنان) هۆشی کۆمەڵایەتی دروست دەکات. ئێمەش دەتوانین بڵێین کەباری کۆمەڵایەتی یەکێکە لەسەرچاوەکانی هۆشی کۆمەڵایەتی بەڵام هەڵەیە بوترێ کە تاکە سەرچاوە یان هیچ نەبێ سەرچاوەی سەرەکییەتی ئەگینا ناتوانین وەڵامی ئەو پرسیارە بدەینەوە کە: بۆچی مارکسیەت خۆی (کەفەلسەفەی چینی کرێکارە) لەو وڵاتانە زیاتر بڵاوبۆوەوە کەچینی کرێکار تیایاندا زۆر لاوازە یان دەتوانین بڵێین کەوا وەکو چینێك وجودی نەبووە؟

## ٢- هێزەکانی بەرهەم هێنان و پەیوەندەکانی بەرهەمهێنان

زانیمان کە بەپێی بیروبۆچوونی مارکسیەت هاتنە کایەی هۆی پێشکەوتوی بەرهەم هێنان (ئامێری نوێ..هتد) دەبێتە هۆی ئەوەی کەپەیوەندێکی نوێی بەرهەم هێنان بێتە کایەوە، واتە ئامێرە نوێکان (بۆ نمونە) سەرمایەداری یان هێنایە کایەوە.

ئەمە راستە بەڵام باس کردنی ئەمە بەرەهایی (مطلق) راست نییە، چونکە ئەمە هەموو قۆناغێك و سەردەمێکی مێژوویی ناگرێتەوە، مارکسیەت دەیەوێ وابێ ئەوەتا مارکس دەڵێ: لەو ئاشەی کەبەدەست دەخولێتەوە کۆمەڵگای دەرەبەگایەتی دروست دەکات(٧٦). ئەمەش تێروانینێکی زۆر سادەیەو هەوڵێکە بۆ بەزۆر سەپاندنی بۆچوونەکەی خۆی بەسەر هەموو قۆناغێکی مێژوودا.

لەلایەکی تریشەوەو هەربەپێی بۆچوونەکەی سەرەوە دەرکەوتووە کەوا ئامێری

---

٧٥- هەمان سەرچاوە، ل١٠٩ پەراوێز ٢٢.

٧٦- مارکس، بؤس الفلسفة ل١١٢. مارکس ئاش «دروست دەکات» بەڵام دەڵێ «پێیە دەهێنێ» یان «دەردەخات» بەڵام قسەکانی پێشوو دوای ئەو قسەیە هەر ووشەی «دروست دەکات» دەگەیەنن.

نوێ چینی ناوەڕاست (ئەندازیاران، مووچەخۆران...)ی بەرەو گەورە بوون بردووە، بەڵام مارکسیەت نایەوێ دان بەوەدا بنێ وەك دوایی باسی دەکەین (لەبابەتی سەرمایەداری‌دا).

## ٣-چینەکان و ململانەی نێوانیان

مانیفێستۆ (البیان الشیوعي) مێژوو بە مێژووی ململانەی چینەکان دەزانێ. ئەمەش لەدوو ڕووەوە هەڵەیە:

١- مارکسیەت ململانەی چینەکان لەئەورووپادا دەکاتە پێوانە بۆ هەموو ململانەیەکی تری جیهان بەڵام تەنانەت بۆ ئەورووپاش ئەمە تەنها بۆ بەشێکی مێژووەکەی ڕاستە چونکە لەو ماوەیەی مەبەستانەو کە چینی بورجوازی و چینی پرۆلیتاریا هەبوون و لەململانەدا بوون، ململانەی تر هەبوون کەڕەوڕەوەی مێژوویان بەرەو شوێنی تر دەبرد بەتایبەتیش ململانەی نێوان نەتەوەکان (بێ گومان مارکسیەت ئەمەش هەروا بۆ ململانەی چینەکان دەگەڕێنێتەوە)، ململانەی چینەکانیش بەو زلی و بەربڵاوییە نییە کەمارکسیەت باسی دەکات و کاتێك هەبوو بێ ململانەی تری لەپاڵەوە هەبووە.

٢- ئەگەر ململانەی چینەکان بزوێنەری مێژووە ئەی لەکۆمەڵگای چاوەڕێ کراوی ئەد نەهاتووی کۆمۆنیستدا کەململانەی چینەکان نامێنێ ئایا مێژوو دەوەستێ؟

پێش مارکس کەسانێك هەبوون کەڕۆڵێکی گەورەیان بۆ ململانەی چینەکان دانابوو، مارکس ئەمە دەزانێ و دەڵێ کەخۆی ئەمەی نەدۆزیبووەوە بەڵکو ئەو شتەی ئەو دۆزیبوویەوە تەنها ئەوەیە کە:-

١- هەبوونی چینەکان بەندکراوە بەقۆناغی دیاری کراوی گەشەسەندنی بەرهەم هێنان.

٢- هەروەها ململانەی چینەکان کۆمەڵگا دەگەیەنێتە دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریا.

٣- ئەم دیکتاتۆریەتەش قۆناغێکە بۆ نەمانی چینەکان(٧٧).

بەپێچەوانەی بەشی یەکەمی قسەکەی مارکس نموونەهەن لەسەر پەیدابوون و نەمانی چینەکان لەیەك ئاستی گەشەسەندنی بەرهەم هێنان. نموونەی یەکەم لە سەر ئەوە ژاپۆنە کەکاتێك ترسی هەڕەشەی ئەمەریکا. (ساڵی ١٨٥٣ز)ی لەسەربوو دەرەبەگەکانی لەساڵی (١٨٦٨ز)دا هەموو زەوی‌یەکانیان دایە دەوڵەت و سەنەدی پارەیان لێ وەرگرت ئەویش بۆ ئەوەی وڵاتەکە بێتە وڵاتێکی پیشەسازی(٧٨) بەم شێوەیەش هەر لەو ساڵەدا کەگەشەسەندنی بەرهەم هێنان لەشوێنی خۆی‌دا بوو دەرەبەگەکان وەکو چینی دەرەبەگ نەمان (ئەمەش جگەلەوەی کەبەبێ ململانەی چینەکان ئەم کارە ڕووی‌دا)

---

٧٧- گلکراوی کارل مارکس، ل٦٢ (لەنامەیەکی مارکس‌دا بۆ یوزێف قایدمایەر- ١٨٥٢).

٧٨- بڕوانە: د. ابراهيم الطحاوي الاقتصاد الاسلامي... ، ل١٥٢.

نموونەیەکی تر ئەوەیە کە(عمر کوری الخطاب) زەوییەکانی عێراقی دابەش نەکرد بەسەر جەنگاوەرەکان، ئەگەر ئەمەشی بکردایە چینێکی دەرەبەگ پەیدادەبوو، ئەویش بەپێ ئەوەی کەگەشە سەندنی بەرهەم هێنان گۆڕانێکی بەسەردا هاتێ.

هەروەها لەکاتی (ئەمەوییەکان)دا و بەچەند بڕیارێکی دەوڵەت، کەس و کاری دەسەڵاتدارەکان بوونە خاوەن زەوی بەپێ ئەوەی گۆڕان بەسەر بەرهەم هێنان دا هاتێ.

سەبارەت بەدیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریاش (کەلەڕاستیدا پێش مارکس گراکوس بابیفG.Babeuf ی فەرەنسی بیری لێ کردبووەوە لەگەڵ نەختێك جیاوازیدا) (٧٩) زاراوە کەوا ئەوەی بەرپابوو دیکتاتۆریەتی حزبی شیوعی و لیژنەی مەرکەزی بوو نەك هی کرێکاران، ئەوەتا لینین خۆی دان بەوەدا دەنێ کەوا کرێکاران هیچ بەهیچ ناکەن و پێویستیان بەپێشەوای هەڵبژێرراوی شۆڕشگێڕی رۆشنبیر هەیە کەبەناوی پرۆلیتاریاو بەپارمەتی ی ئەوەوە شۆڕشەکە بەرپا بکات(٨٠)، ئەنجامیش ئەوە بوو کەحزب و لیژنە مەرکەزییەکەی حوکیان کرد و دیکتاتۆریەتی چینی کرێکار رووناکیی نەبینی، ئەمەش تەنانەت هەندێك مارکسیش دانی پێدا دەنێن(٨١) لەجیاتی نەمانی چینەکانیش پرۆلیتاریا هەر مایەوەو لەبری سەرمایەدارو دەرەبەگ چینێکی نوێ پەیدا بوو کەچینی بیروکراتە (فەرمانبەرانی دەزگاکانی دەوڵەت).

بەڵێ: بیروکراتەکان چینێك پێك دەهێنن ئەویش بەپێی پێناسەی (چین) لای مارکس. مارکس لەکتێبی (١٨ی برومێری ناپلیۆن بوناپارت)دا (ساڵی ١٨٥٠) سێ مەرجی داناوە بۆ چین کەدەتوانرێ بەم جۆرە کورت بکرێنەوە: (جۆری ژیان، بەرژەوەندییەکان، رۆشنبیری) کەئەندامانی چینەکە تیایاندا بەشدارو وەکو یەك بن(٨٢)، بەپێی (ریمۆن ئارۆن)یش مەرجەکان لای مارکس دوانن (جۆری ژیان، هەروەها ئەندامانی چینەکە بزانن کەیەکن بەرامبەر دوژمن)(٨٣) بەم شێوەیەش دەتوانین (جۆری ژیان)و (هۆشمەندی) بکەینە دوو مەرجی چین و کەهەر (وجودی کۆمەڵایەتی و هۆشی کۆمەڵایەتی) دەگرنەوە ئەم دوو یان سێ مەرجەش لەبیروکراتەکاندا هەن بۆیە چینێك پێك دەهێنن.

ئەگەر وەکو لینینیش بناغەی چین بە(جێگەی مرۆڤەکان لەبەرهەم هێناندا)(٨٤)

---

٧٩- بڕوانە: کۆڵ، رواد الفکر الاشتراکی، ل٣٩

٨٠- ئەمەش لینین دەخاتە خانەی (بلانکی)یەکان)، بڕوانە کۆمەڵێکی وا کە رووی لینین کراوە: جیلاس (؟)، مجتمع غیر کامل، ل١٣٠. (بلانکی) بڕوای بە حزبی جەماوەری نەبوو.

٨١- بڕوانە کتێبەکەی لیان ترۆتسکی، الثورة المغدورة

٨٢- بڕوانە: کاڵاتین فکر کارل مارکس، بەرگی ١، ل١٤٤-١٤٥.

٨٣- بڕوانە: ریمۆن ئارۆن، صراع الطبقات، ل٢٩.

٨٤- بۆ پێناسەی لینین بۆ چین بڕوانە سەرچاوەی سەرەوە، ل٣٠-٣١.

بزانین ئەوا بیروکراتەکان ئیسان چینێك پێك دەهێنن چونکە ئەوان رۆڵی بەڕێوەبەری بەرهەم هێنان دەبینن.

ترۆتسکی - بۆ ئەوەی ئەفسانەی جووتەکە: (ئەهۆرامزدا)و (ئەهریمەن) نەشێوێنێ و تەنها کرێکارو سەرمایەدار هەبن-دژی ئەوە بووە کەبیروکراتەکان بە کێتی سۆڤێت سەر بە(سەرمایەداری دەوڵەت- رأسمالیة الدولة) بزانێ گوایە نازناو (القلب)یان نی یەو مافی تایبەتی ی خاوەنێتی (الملکیة)یان نی یەو بۆیان نی یە (چونکە مووچە خۆرن) کورو کورەزاکانیان بخەنە جێ ی خۆیان(٨٥). بەلام ترۆتسکی بیری لەوە نەکردەوە کەکرێکارانیش ئەم مەرجانەیان تێدا نی یە بەلام لەگەڵ ئەوەشدا هەر بەچین حساب دەکرێن. بەم پێ یە نەك هەر بیروکراتمان هەیە بەڵکو تەکنۆکراتیش هەن کەچینێك پێك دەهێنن و کەبریتین لەئەندازیارو بەڕێوەبەرانی پرۆژەو میکانیکیەکان..هتد کەهەندێك کەس پشێینی کردووە کەببنە چینێکی پێشەوا.

ئەوەی کەزیاتر رێ ی تێ دەچێ ئەوەیە کەگەشەسەندنی هۆکانی بەرهەم هێنان لەهەندێك حاڵەتدا ببنە هۆی پەیدابوونی چینی نوێ، ئەمەش بە(مطلق)ی لەمارکسەتدا هەیە، کەچی مارکسەت (مطلق) لەدەست خۆی دەردەکات و نایەوێ دان بەم دوو ئەنجامەی خوارەوەدا بنێ:

١- چ لەکۆمەڵگای سەرمایەدارو چ لەکۆمەڵگای چاوەڕێکراوی قەد نەهاتووی کۆمۆنیستدا گەشەسەندنی هۆکانی بەرهەم هێنان دەبنە هۆی پەیدا بوونی چینی بیروکراتی و تەکنۆکرات..هتد.

٢- بەم شێوەیە نەمانی چینەکان لەکۆمەڵگای کۆمۆنیستدا نەك هەر خورافەتێکی نازانستی یە بەڵکو هەروەها لەگەڵ مارکسەت خۆیدا ناگونجێ.

هۆی ئەم نارێکی یەش (حەزو ئارەزووی) مارکسە، واتە حەزکردن بەنەمانی سەرمایەدارو سەرکەوتنی پرۆلیتاریاو پاشان نەمانی چینەکان.. مەسەلە ئارەزووی نەفسە..

## ٤- جۆرەکانی بەرهەمهێنان

### أ- کۆمۆنی سەرەتایی

ئەمڕۆ کۆمەڵگا سەرەتایی یەکان مەیدانێکی باشی لێکۆڵینەوەن لەبارەی کۆمەڵگا سەرەتایی یەکانی مێژوو. لەکۆمەڵگای ئانداماندا (؟Andaman- کەلەئۆقیانووسی هیندیدا دەژین- زەوی و راوکردن هاوبەشە بەلام خاوەنێتی ی تایبەتیش هەیە بۆ نموونە درەختێکی دیاری کراو کەکەس بۆ نی یە دەستکاری بکات خاوەنەکەی خۆی نەبێ(٨٦).

---

٨٥- ترۆتسکی، الثورة المغدورة، ل١٥٢. ٨٦- د. قباری محمد اسماعیل، علم الانسان، ل٣٩٢-٣٩٣.

کەواتە دیارە کەخاوەنێتی ی گشتی زیاتر بۆ ئەو شتانەیە کەزۆرن (وەکو زەوی کەخەڵکەکە بۆ کشت وکاڵ بەکاری نەهێنن) یان ئەوانەی لەبەر دەست دا نین (ئاژەڵی راوکراو). ئەمەش قسەیەکی (بلانکی)ی کۆمۆنیستی نامارکسیم بیردەخاتەوە کەئەوە بەدرۆ دەخاتەوە کە کۆمەڵگا کۆنەکان کۆمۆنیست بوون و دەڵێ کەواتە ولاتانی ئەمڕۆ (کاتی بلانکی) کۆمۆنیستن لەبەرئەوەی دەریاکان ناکەنە خاوەنێتی ی تایبەت (ملکیة خاصة)(٨٧).

هەر بەباوەڕی بلانکی: خاوەنێتی ی تایبەتی ی زەوی کاتێك پەیدا دەبێ کەزەوی دەگمەن بێ لەچاو ژمارەی ئەو کەسانەی کەدەبێ کاری تیا بکەن(٨٨). لەبەرئەمەش کۆمەڵگا کۆنەکان نەك هەر کۆمۆنیست بوون بەڵکو ئەوپەڕی تاکرەویش بوون(٨٩).

هەڵەکانی مارکس و ئێنگلز (بەتایبەتی ئێنگلز) لەوەدا بوون کەپشتیان بەستبوو بە کتێبی (کۆمەڵگای کۆن)ی (لویس مۆرگان) -کەلەگەڵ بیروبۆچوونیان دا گونجاوبوو- زۆربەی بۆچوونەکانی مۆرگانیش پووچەڵ کراونەتەوە بەهۆی لێکۆڵینەوەی نوێ(٩٠). بۆ نموونە لەبارەی سیستەمی (دایکانە)یان (دایك سالاری)(٩١) کەبەهۆی لێکۆڵینەوەی زانستی یەوە دەرکەوتوە کەنی یەو نەبووە.هەتا ئەگەر ئافرەت پایەیەکی بەرزیشی هەبوبێ. هەروەها دەرکەوتووە کە مەرج نی یە سیستەمەکانی خزمایەتی ی لەهێڵی دایکەوە (خاڵ. خوشکی دایك...) -کەدەسەڵات لێرەدا بۆ خاڵە- پێش سیستەمەکانی خزمایەتی لەهێڵی باوکەوە (مام، خوشکی باوك..) - کەدەسەڵات لێرەدا بۆ مامە- هاتبن(٩٢). ئەوەش بەپێچەوانەی لێکۆڵینەوە کۆنەکان کەمارکسیەت پشتی پێیان بەستبوو.

لەکۆمەڵگای دوورگەکانی ترۆبریاند Trobriand دا کەبەکۆمەڵگایەکی «دایکانە» ناسراوە میراتی لەرێی دایکەوەیە واتە هەر کەسێك میراتی ی خاڵی خۆی وەردەگرێ هۆی رۆڵی دایکیش لێرەدا ئەوەیە کەخەڵکەکە پیاوەکە بەسەبەبی منداڵ بوون نازانن واتە بروایان بەباوکێتی ی «بایۆلۆجی »ی پیاو نی یە بەڵکو بەباوکێتی ی «کۆمەڵایەتی»(٩٣) کەواتە مەسەلە لێرەدا نەفرە مێردی یەو نەڕۆڵی ئابووری ی ئافرەتە وەکو لێکۆڵینەوە

---

٨٧- ج. د. هـ کول، رواد الفکر الاشتراکي ل٢٥٠. ٨٨- هەمان سەرچاوە.

٨٩- هەمان سەرچاوە بەڵام گومانمان لەمەدا هەیە.

٩٠- موریس گۆدۆلیێ، لە: حول نمط الانتاج الاسیوي ل١٧٦. (گۆدۆلیێ ئێستا کابرایەکی مارکسی یە.

٩١- (دایکانە) بۆ لێکۆڵینەوەکانی ئەمڕۆ گونجاوترە لە (دایك سالاری) چونکە دەرکەوتووە کەمەسەلەکە زیاتر مەسەلەی خزمایەتی و میراتی یە...هتد نەك دەسەڵات. هەمان شتیش بۆ (باوکانە) بەڵام مارکسی یە بێ ئاگاکان هێشتا باسی (دایك سالاری)و (باوك سالاری) دەکەن هەروەها هەندێك لەنەیاری مارکسی یەکانیش هێشتا ئەو دوو زاراوەیە بەکار دەهێنن.

٩٢- سەرچاوەی پێشوو، ل١٧٧-١٧٨.

٩٣- د. قباری محمد اسماعیل، علم الانسان، ل٢٦٢-٢٦٣.

کۆنەکان و هەروەها مارکسیەت دەڵێن.

بیروبۆچوونی مارکسی ی تریش هەن کەئەمڕۆ هەندێك مارکسی (ئەوانەی کەلەشت دەکۆڵنەوە نەك مارکسی یە در و شمبازەکان!) ئەوە دەزانن کەوا هەڵەن وەکو:

١- ئابووری شوانێتی ی کۆچەری پێش هی کشتوکاڵ هەبووە(٩٤).

٢- مرۆڤە سەرەتایی یەکان زیا بەرهەمیان نەبووە (فائض الانتاج)(٩٥).

٣- مرۆڤی زوو ئابووری و خزمایەتی و تێڕوانین بۆ جیهانیان نەبووەو کاتیان نەبووە «کەمالیات» دابێنن وەکو ئاین و خزمایەتی(٩٦).

کەواتە بەم جۆرە ئەگەر کۆمەڵگای کۆن بەکۆمەڵگایەکی (مشاعی) بزانین ئەمە دەبێتە بۆچوونێکی بێ بەڵگەی زانستی و مێژوویی و دیارە کەئارەزووی لەپشتەوەیە، ئارەزووی حەزکردن بەوەی کەئاسەلێنرێ کەوا کۆمەڵگای یەکەم خاوەن چین و چەوساندنەوەی چینایەتی نەبووەو کەوا کۆمە ڵگای کۆمۆنیستی چاوەڕێ کراو بۆی هەیە بەپێی و شتێکی خەیاڵی نییە.

## ب- کۆیلایەتی

لەم جۆرەدا (لای مارکسیەت) زیا بەرهەم و خاوەنێتی ی تایبەتی بەپەیدابوون و سیستەمی دابکانە گۆڕا بۆ سیستەمی باوکانە. دەوڵەتیش پەیدا بوو بۆ سەرکوت کردنی کۆیلەکان.

ئەمەش بەهۆی زۆربوونی کۆیلە بوو، جەنگیش سەرچاوەی دەستکەوتنی کۆیلەکان بوو (هەر لای مارکسیەت).

کەواتە: (کۆمەڵگا بێ چین ← جەنگ ← کۆیلەی زۆر ← کۆمەڵگای چیندار) بەڵام لەلایەکی ترەوە هەر لای مارکسیەت جەنگ هۆیەکی چینایەتی ی هەیەو لەکۆمەڵگای بێ چین دا نییە. کەواتە چۆن جەنگ لەکۆمۆڵی یەکەم دا (کەچینی تێدا نەبووە) پەیدابوو؟(٩٧).

کۆیلایەتی وەك جۆرێکی بەرهەم هێنان تەنها لەئەوروپادا بەتایبەتیش لەوڵاتی (یۆنان) و (رۆما)دا هەبوو بەڵام هەتا لەوێش دا بەو رادەیە نەبووو بەپێی زانای ئەڵمانی (ئیتکوف)(٤) رێژەی کۆیلەکانی یۆنان و دەوڵەتی رۆما تەنها ١٪ یان ٢٪ی خەڵکی شارەکان بوو نەك ١٠٪ تا ٨٠٪ وەکو مارکس و ئێنگلز دەیانوت و کۆیلەکان بەرهەم هێنەری سەرەکی ی کشتوکاڵی یۆنانی نەبوون(٩٨).

---

٩٤- گلاستواین، لە: حول نمط الانتاج الاسیوی، ل١٧٥. ٩٥- هەمان سەرچاوە، ل١٨١و ١٨٢.

٩٦- هەمان سەرچاوە، ل٢٠٢.

٩٧و ٩٨- د. الیاس فرح، تطور الفکر الماركسي، ل٢٠٠.

### ج- دەرەبەگایەتی

گەشەسەندنی هێزەکانی بەرهەم هێنان (ئامێرەکان...) گەیشتە پلەیەکی وا کە نەدەگونجا لەگەڵ پەیوەندە کۆنەکانی بەرهەم هێنان بۆیە پێویستی کرد کەئەو پەیوەندە کۆنانە لابچن.. مارکسیەت وادەڵێ بەڵام دەبینین کەوا نەمانی جۆری کۆیلایەتی پەیوەندی نەبوو بە گەشەسەندنی هێزەکانی بەرهەم هێنان بەڵکو لەبەر هێزیەکی دەرەکی کەهێرشەکانی خێڵەکانی دەوروبەر بووامەبەست لێرەشدا دەوڵەتی رۆمایە).

بەپێی ماددیەتی دیالێکتیکی و ماددیەتی مێژوویی دەبوایە چینی زۆر دەستە شۆڕشەکەیان بەرپا بکردایە دژی دەرەبەگەکان(۹۹). بەڵام راستی ئەوە بوو بورجوازیەت شۆڕشەکەی بەرپاکرد. مارکسیەکانیش شۆڕشێکی نموونەیی کەدژ بەدەرەبەگەکان بووبێ وەکو شۆڕشی فەرەنسا (۱۷۸۹ز) بەشۆڕشێکی بورجوازی ناو دەبەن و ماددیەتی دیالێکتیکی و مێژوویی یان لەیاد دەچێ کەئەگەر ئەم دوانەیان لەیاد نەچوایە دەیانوت دەبوایە شۆڕشەکە جووتیاران بەرپایان بکردایە.

### د- سەرمایەداری

لێکۆڵینەوەکانی مارکس لەبارەی سەرمایەداریەوە پڕ هەڵە بوون بەڵام بەهەر حاڵ لەلێکۆڵینەوەکانی لەبارەی پێش سەرمایەداری باشتر بوون چونکە خۆی لەو سەردەمەدا دەژیا لەکاتێکدا لەبارەی پێش و پاش سەرمایەداری زیاتر (علم الغیب)ی بەکار دەهێنا(۱۰۰).

**هەڵەکانی مارکس لەبارەی سەرمایەداری دوو هۆیان هەیە:**

۱- مارکس چەند بیرێکی ئامادەی لەمێشکدا بوو کەدەیویست واقع و لێکۆڵینەوەکانی خۆی لەگەڵیاندا بگونجێنێ.

۲- سەرمایەداری ی رۆژانی مارکس لەسەرەتای گەشە کردنیدا بوو.

مارکس سەرمایەداری ی کردبووە کلیل بۆ زانینی جۆرەکانی پێشووی(۱۰۱) بەڵام چەسپاندنی ئەمە تووشی هەڵەی زۆری کرد. زۆر لەپێشبینییەکانی هەڵە دەرچوون و چەند جارێك پێشبینیی ی وای دەکرد کەدەبوایە لەکاتی ژیانی خۆیدا روویان بدایەوە، جا کەروویان نەدەدا ئەو کەسانەی کەهاوچەرخی بوون ئەمەیان دەکردە بابەتی

---

۹۹- ئەمەش بەپێی ماددیەتی دیالێکتیکی (یاسای دژەکان کەهەر دژێك ئەوەی تر دروست دەکات و دەکەونە ململانەی یەکتر) هەروەها بەپێی ماددیەتی مێژوویی (ململانەی چینەکان).

۱۰۰- (کۆزێ) دەڵێ کەوا مارکس زۆر وورد تێبینی ی گەشەکردنی سەرمایەداری ی کرد تاتارەراستی سەدەی ۱۹ و دوای ئەوە گوێی نەدایە رووداوەکانی کاتی خۆی: الماركسية والفوضوية، ل۴۰۳-۴۰۴.

۱۰۱- گارۆدی، کارل مارکس، ل۱۱۹.

رابواردن(١٠٢).

بەکێک لەو پێشبینیانەی لەبارەی نەمانی چینی ناوەڕاستە لای مارکس چەوساندنەوەی پرۆلیتاریا زیاتر دەبێ و کۆمەڵگا دابەش دەبێ بەسەر دوو چینی سەرەکی: بۆرجوازیەت و پرۆلیتاریا.. ئەو کەسانەش کەسەر بە چینی ناوەڕاستن واتە کاسبەکان جووتیارانی سەربەخۆ، فەرمانبەران... هتد بەشێکی کەمیان دەبنە بۆرجوازی بەشەکەی تریش هەژار دەبن و دەبنە پرۆلیتاری.

واقع مارکسی بەدرۆ خستەوە: بۆ نموونە ساڵی (١٩٥٤) لەفەرەنسادا چینی ناوەڕاست (٦،٥) ملیۆن کەس بوو جگە لەیەک ملیۆن جووتیاری بچووک لەکاتێکدا پرۆلیتاریا (٦،٦) میۆن کەس بوون(١٠٣).

لەئەڵمانیاش دوا بەپێی (کارل کاوتسکی) ی مارکسی ی ئەڵمانی (١٨٥٤-١٩٣٨) -کەدوایی لای مارکسیەکان بەتەحریفی ناوبرا- چینی ناوەڕاست لەساڵی (١٨٨٢)ەوە تا (١٩٠٧) بەڕێژەی ١٧٦٪ زیاد بوو لەکاتێکدا ئەوانەی کەکرێ وەردەگرن تەنها ١٠٪ زیاد بوون و کرێکاری سەربەخۆ ٣٣٪ کەم بوون(١٠٤) ژمارەکانی ساڵی (١٩٥٤) ش نووسەرێکی مارکسی لەویش وەکو مارکسیەک پێنەکەی ئامادەیە: «ژمارەی گەورەی چینی ناوەڕاست پێویستە پشت گوێ بخرێ چونکە گرنگیی ی کەمە لەچاو سەرمایەدارەکان (١٠٥) . جائەگەر مەبەست لە گرنگیی ی ئابووری بێ -واتە قسەکەی (مانیفێستۆ) کەئەم چینە دەبێتە چینێکی ناسەربەخۆ-(١٠٦) ئەوا پرۆلیتاریاش هەروا لەرووی ئابووریەوە سەربەخۆ نی یە.

بەم شێوەیە تێبینی یەکەی مارکس سەبارەت بەنەمانی چینی ناوەڕاست ناواقعی و نازانستی بووو حەزی مارکسی لەدوادا بوو: حەز بەمانەوەی بۆرجوازیەت و پرۆلیتاریا بەتەنیا بۆ ئەوەی زۆرانبازی بکەن و لەکۆتاییدا دووەمیان سەربکەوێ.

هەڵەیەکی مارکسیش ئەوەبوو کەگەشەسەندنی تەکنۆلۆجیای لێرەدا پشت گوێ خست، ئەو گەشەسەندنەی کەپێویست بەکرێکار کەمتر دەکات (بەهۆی بەکارهێنانی زیاتری ئۆتۆماتیکیەت)و ژمارەی چینی ناوەڕاستی فەبەکردو.لەجیاتی ئەوە وای دەزانی کەحەتمی بوونی سەرمایە (التركز الرأسمالي) لای سەرمایەداران بەشێوەیەکی بنەڕەتی گۆڕانێکی وا بەسەر پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکاندا دەهێنێ کەشۆڕشی پرۆلیتاریای بەدواوە بێ.

---

١٠٢- ف. ملیرنکە، کارل مارکس، ل١٥٩.

103- F.Nicolon, In, World Marxist Review, Vol.2,no.4, 1959,p.47.
104- N.Mondet, en; Journal des Economistes, 15, Nov. 1926 . p.332.
105- Nicolon, Ibid, p.48.
106- Ibid, p.47.

بەهەمان جۆر رەخنەی زۆر لەبڕیاری مارکس سەبارەت بەلاهەژاربوونی بەردەوام بووی پڕۆلیتاریا) گیرابوو، واتە راست نی یە پڕۆلیتاریا بەبەردەوامی هەژار دەبێ، بەپێی (میرنگ)ی مارکسی ی ئەڵەمانیش بەشی گەورەی چینی کرێکار گەشتە ئاستی ژیانی هەندێك تێشووی وردە بۆرجوازی(۱۰۷). پێویستیشە باسی هەژار بوونی (نیسبی) بکرێ واتە کەم بوونی داهاتی کرێکاران لەچاو هی سەرمایەدارەکان نەك هەژار بوونی رەها (مطلق)(۱۰۸)، هەژار بوونەکەش لەو وڵاتانە روودەدات کەلەسەرەتای پیشەسازیدان چونکە بەشێکی دەستکەوت بۆ پرۆژەی تر تەرخان دەکرێ(۱۰۹). بەهەرحاڵ ئەم رەخنانە لەمارکسیەت رووی سەرمایەداری سپی ناکەن چونکە تا دابەروەری لەدابەش کردنی سامان هێشتا زۆرە. ئەگەر لێرەشدا رەخنە لەسەرمایەداری نەگرین هۆکەی ئەوە نی یە کەسیستەمێکی راستە بەڵکو لەبەر ئەوەی کەئەم باسەمان بۆ سەرمایەداری تەرخان نەکردووە.

هەڵبەتە ئێنگلز خۆی -پاش مردنی مارکس- رەخنەی هەبوو لەبەرنامەی ساڵی (۱۸۹۱)ی پارتی سۆشیالیستی دیموکراتی ئەڵمانی (کەمارکسیەکان دەستیان بەسەردا گرتبوو)و کەتیایدا وتراوە کەوا هەژاری پڕۆلیتاریا لەزیادبووندایە، ئێنگلزیش دەڵێ کەوا رێکخستن و بەرگری ی کرێکاران دەبنە کۆسپ بەرامبەر زیادبوونی ئەم هەژاریە(۱۱۰).

مارکس بڕوای وابوو کەپرۆژە گەورەکان پرۆژە بچووکەکان لەناو دەبەن و ژمارەیەك پرۆژەی قەبە دەمێنەوە ئەمەش کەپێی دەوترێ (چڕبوونی سەرمایە- التركز الرأسمالي) بەلام (ایزنشتاین)ی مارکسی ی ئەڵەمانی (کەلای مارکسیەکان بەتەحریفی و لادەر ناسراوە) دەبوت کەوا وردە پرۆژەکان بوارو تایبەتی یەکانیان دەگۆڕن بەلام قەد بەرامبەر پرۆژە گەورەکان نابەزن، (کارل کاوتسکی)ش بڕوای وابوو کەئەمە تەنها شتێکی کاتی یە(۱۱۱) لەراستیشدا ئەم چڕبوونە هەیەو دەبینرێ و هەوڵدەدرێ کە کۆمپانیا (احتكاري)یە گەورەکان گەورەتر بکرێن بەلام هێشتا پرۆژەی بچووك هەر هەیەو لەوە ناچێ لەناو بچن.

جگەلەرەخنەی ئەم مارکسی یە (تەحریفی)یانە، کۆمۆنیستی (فوضوی)ی رووسی میخائیل کرۆپۆتکین M.Kropotkin (۱۸٤۲-۱۹۲۱ز) دەبوت کەوا کارگە گەورەکان هەر پێویستیان دەبێ بەکارگە بچووکەکان بۆ بەرهەمی لاوەکی(۱۱۲).

---

۱۰۷-میرنگ، کارل مارکس، ل۱۲٦ کەسالی تریش پێش مارکس باسی هەژاربوونەکەیان کردبوو. (هەمان سەرچاوە).

۱۰۸و۱۰۹- ر. گاروّدی، صراع الطبقات، ل۱٦۰.

۱۱۰- محمود امین العالم، ماركيوز او فلسفة الطريق المسدود ل۷۰.

۱۱۱- كول، تاريخ الفكر الاشتراكي (الماركسية والفوضوية)، ج۲، ل۵۸۰-۵۸۱.

۱۱۲- هەمان سەرچاوە.

زیا بەها (القیمة الفائضة) بەردی بناغەی ئابووری‌ی سیاسی مارکسیەتە، لای مارکسیەتیش ئەم یاسایە بریتی‌یە لەیاسای سەرەکی‌ی ئابوری سەرمایەداری‌و جەوهەری چەوساندنەوەی کرێکارانە. لێرەش بەکورتی رووڕ دەکەینەوە:

هێزی کارکردن بەهایەك بەکەڵویەلی بەرهەم هێنراو دەبەخشێ کەبەهای ئاڵوگۆڕین (القیمة التبادلة) یاخود هەر بەکورتی بەها (القیمة)ی پێ دەوترێ، کابرای سەرمایەداریش کەکالا دێنێتە بەرهەم بەنرخێکی زیاتر لەنرخی کەرەسەکان دەیفرۆشێ بەکێکیش لەکەرەسەکان کاری کرێکارانە. جائەو بەهایەی کەکاری کرێکاران دەیهێنێتە کایەوە ئەوەیە کەسەرمایەدار پێویستە بیدات‌ە کرێکار بەلام سەرمایەدار لەمە کەمتر دەدات‌ە کرێکار، جیاوازیش نێوان دوو بەهاکە (زیا بەها)ی پێ دەوترێ یاخود بەشێوەیەکی تر: کرێکار بەهایەك دەهێنێتە بەرهەم کەهیچ لەبری وەرناگرێ ئەمەش نهێنی‌و سەرچاوەی چەوساندنەوەی کرێکارە.

سەرمایەش بریتی‌یە لەدوو بەش: (سەرمایەی نەگۆڕ) کەلەو پارەیە کەلەبیناو کارگەو ئامێرەکان‌و کەرەسەو سووتەمەنی.. سەرف دەکرێ بەشی دووەمیش (سەرمایەی بگۆڕ) کەمەسرەفی کرێکارانە.. تەنها سەرمایەی بگۆڕیش زیا بەها دەهێنێتە بەرهەم.

بەلام وەکو تێبینی کراوە نابرێکی هەیە نێوان ئەم قسەیە -کەلەبەرگی یەکەی کتێبی (سەرمایە)دا وتراوە- لەگەڵ بۆچوونێکی تر کەلەبەرگی سێیەی (سەرمایە)دا باس کراوە.. ئەم بەرگەش ئینگلز پاش مردنی مارکس بلاوی کردبووەوە ئەویش ئەوەیە کەدوو سەرمایەی یەکسان دوو قازانجی یەکسان پەیدا دەکەن ئیتر گرنگ نی‌یە رێژەی (سەرمایەی بگۆڕ) بۆ (سەرمایەی نەگۆڕ) چەند بێ بەم شێوەیەش ئەگەر دوو سەرمایە یەکسان بن کەلەیەکێکیان‌دا (سەرمایەی بگۆڕ) زیاتر بێ لەسەرمایەی بگۆڕی سەرمایەکی تر ئەوا قازانج ناگۆڕێ. کەواتە سەرمایەی بگۆڕ دەور نابینێ لەبەرهەم هێنانی (زیابەها) ئەمەش کەپێچەوانەی قسەی یەکەمەو کەلەبەرگی یەکەی (سەرمایە)دا باس کراوە(113).

رەخنەیەکی تریش ئەوەیە ئەگەر تەنها (سەرمایەی بگۆڕ) سەرچاوەی قازانج‌و زیا بەرهەمە بێت کەواتە سەرمایەدارەکان نەك کرێکاران تووشی دیاردەی (هەژاربوون) دەبن(114).

شایەنی باسیشە کەوا (چارلز هۆڵ)ای بەریتانی (لەدوربەری 1740 تادەوروبەری 1820 ژیابوو) پێشتر وتبووی کەدەوڵەمەندەکان (کارکردن) لەهەژاران دەکڕن بەکەمتر لەبەها راستەقینەکەی. کرێکار لەهەشت رۆژدا یەك رۆژ بۆ خۆی کاردەکات‌و حەوتەکەی تر بۆ

113- د. الیاس فرح، تطور الفکر الماركسي، ل302.

114- هەمان سەرچاوە ل301.

دەوڵەمەندەکان ئەمەش کەهەمان فیکرەی (زیابەها)یە. هەروەها دوای ماوەیەك لەنووسراوێکی ئابووریناسێکی وەك (تۆماس هۆدگسکین)دا باسی ئەمە کراوەتەوە(١١٥) واتە بەر لەمارکس کەسی واهەبوون کەباسی (زیابەها) بکەن.

## هـ- کۆمۆنیزم

ئابووریناس جێرۆم بلانکیJ.Blanqui (کەئەمە بلانکی ی کۆمۆنیست نی یە) ناوی سۆشیالیستی ئەوپاری Utopian Socialistsی(١١٦) نابوو لەسان سیمۆن و فۆرێن و ئۆوێن، پاش بەکارهێنانی ئەم زاراوەیەش لەمانیفێستۆی کۆمۆنیست- البیان الشیوعی)ی مارکس و ئێنگلزدا، ئەم ناوەیان پێوە لکا(١١٧)، بەلام مارکس و ئێنگلز سۆشیالیزمەکەی خۆیان بە(سۆشیالیزمی زانستی- الاشتراکیة العلمیة) دەزانن.

ئەم «زانستی»یەش لەراستی دا بریتی بوو لەئاواتێك، ئاواتی بەدی هاتنی کۆمەڵگایەکی کۆمۆنیست، ئەم ئاواتەش، یان بلێین ئەم ئارەزووە بەرگێکی زانستی ی کرایە بەر، دەبێ ئێمەش زانستی یانە لێ بکۆڵینەوە تابزانین دەریکەوێ کەسەر بەمیثۆلۆجیا - زانستی ئەفسانەکان)ە نەك زانستی راستەقینە.

بەپێ ی مارکس، «دەبێ» کۆمەڵگایەکی کۆمۆنیست بەدی بێ(١١٨). بەپێی مارکسیەتیش دەبوایە لە(ئینگلتەرا)دا بەدی بهاتایە چونکە بەرزترین ئاستی گەشەکردنی سەرمایەداری تێدا بەدی دەکرا، مارکس هەر چاوەڕێ ی دەکرد و «رمڵ»ی لێ دەدا و هیچ نەبوو، نەلەئینگلتەردا و نەلەفەرەنسا و نەلەهیچ جێگەیەکی تری ئەورووپا بەڵکو بەپێچەوانەوە لەئینگلتەردا -پاشان لەولاتی تر- کرێکاران دەستیان دایە خەباتی نەقابەیی و دەستووری (کەشۆڕشگێری نی یە) ئەمە لەکاتێکدا مارکسیەت کرێکاران بەتاکە چینی شۆڕشگێڕ دەزانێ. ئەمڕۆش لەولاتە سەرمایەدارەکاندا تێشووی تری کۆمەڵگا (لەچیاتی کرێکاران) دەستیان داوەتە کاری شۆڕشگێڕی(١١٩).

بەپێ ی مارکس خۆشی کرێکارانی سەدەی هەژدە دژی دەسەلاتی ئامێر

---

١١٥- بڕوانە: کۆلێ، رواد الفکر الاشتراکی، ل٦٠-٦١.

١١٦- یوتۆپیا: شوێنێکی خەیاڵی یە کەپاسار رەوشت و حکومەتی ی نموونەیی هەیە لەفەلسەفەی سەردەمە ئیسلامی یەکانیش دا بە(المدینة الفاضلة) ناسراوە.

١١٧- بڕوانە: کۆلێ، رواد الفکر الاشتراکی، ل١٦-١٧.

١١٨- کۆمۆنیزم لای مارکس و ئێنگلز جۆرێك یەکە کە حاڵەتی ئێستا ناهێڵێ ئەو حاڵەتێکە و دەبێ دابمەزرێنرێ یان خەیاڵێکە و دەبێ واقع خۆی لەگەڵیدا بگونجێنێ. بڕوانە:

K.Mannheim, Ideology and Utopia, p.112. بۆ گومان ئەمە بەقسەی خۆیان.

١١٩- ئەمە لەقسەی (مارکیوز)، دەربارە ی ئەمەش -بەتایبەتی کرێکارانی ئەمەریکا- بڕوانە: محمود امین العالم، مارکیوز او فلسفة...، ل١٧٠-١٧١.

دەوەستان(١٢٠). کەئەمەش بێ گومان کارێکی نـاشۆڕشگێڕە. وەك چۆن ئەمڕۆ ئامێری خۆبزوێن (ئۆتۆماتیکی) بۆتە هۆی دەرکردنی ژمارەیەکی زۆری کرێکاران و ئەمانە بەپێویستی دەزانن کەدژی بوەستن.

کەواتە هۆی راستەقینەی ئەوەی کەچینێك بەچینێکی شۆڕشگێڕ یان کۆنەپەرست لەقەڵەم بدرێ هۆ کۆنە کەیە..ئارەزوو.

ئەمانی چینەکان لەکۆمەڵگای کۆمۆنیستی خوراڵی دا ئارەزوویەکی تری مارکسە، بۆ ئەمەشیان دیسان هەوڵ دراوە کەبەڵگەیەکی زانستی ی بۆ ئهدرێ بەکردن!!

نەك هەر زانستیش بەڵکو هەروا باوەڕەکانی تری مارکس خۆیان ئەمە بەدرۆ دەخەنەوە. مارکس پێمان دەڵێ کەوا بەرهەم هێنان هەموو لایەنەکانی تری ژیان دێنێتە کایەوە بەڵام چۆن لەکۆمەڵگای کۆمۆنیستدا گەشەکردنی بەرهەم هێنان (ئەو گەشەکردنەی کەنەك هەر زیاد دەکات بەڵکو دەتەقێتەوە)! نابێتە هۆی پەیدابوونی چینی نوێ؟

لەلایەکی ترەوە ئەی جوولەی دیالێکتیکی چی بەسەردا دێت؟ چۆن «دژ»ی نوێ دروست نابێ؟ ململانەی دژەکان دەمرێ؟ مارکسی یەکان هەستیان بەگەورەیی ی ئەم پارچە دراوەی بەرگی مارکسیەیان کرد بۆیە پینەیەکیان لێ دا، ئەوەتا بەپێ ی لینین لەکۆمەڵگای کۆمۆنیستدا (التناقضات) هەن بەڵام ململانەی شەڕیان تێدا نی یە (التناقضات غیر تناحریة)... پینەکەش زۆر لەدراویەکە بچووکترە... ئەمە لێرەدا بەسەو لەبناسی (دیالێکتیك و ماددی یەتی مێژوویی)ادا ڕینەکە دەکولێنینەوە!!

خەونێکی تری کۆمەڵگای کۆمۆنیست ئەوەیە کەلەو کۆمەڵگایەدا مرۆڤ «بەپێ ی توانای خۆی کاردەکات و بەپێ ی پێداویستیەکانی خۆی شتی دەست دەکەوێت» -کەئەمەش داهێنانی (لویس بلان)ی سۆشیالیستی فەرەنسی یە (١٨١١-١٨٨٢)- (١٢١) ئەمەش خەونێکی خۆشە..خەونەو بناغەیەکی زانستی ی نی یەو لەسەر گریمانەیەك بنیات نراوە ئەویش کەمرۆڤ لەئاستی پێداویستیەکاندا دەوەستێ و حەز لەشتی لەمە زیاتر ناکات و ئارەزووی لەکەمالیاتی زۆر لێ یە... دیارە دەبێ مرۆڤی کۆمەڵگای کۆمۆنیست. وابیریکاتەوە.. چۆن و بۆچی؟ هەمووی هەر واهاتووە! گریمانە لەسەر گریمانەو (لەوانەیە) لەسەر (لەوانەیە) بۆیە واز لەمارکسی یەکان بهێنین خەونە خۆشەکانیان ببینن چونکە بەشی زۆریان بەدەنگی تۆزیش ڕاناچەنن.

کەواتە کۆمۆنیزمەکەی مارکس دەچێتە ڕیزی (یوتۆپیاکان) و خەیاڵێکە لەدنیادا نەبووەو لەدنیش نابێ. ئەو مارکسیانەش کەجۆرێ

---

١٢٠- مارکس، بۆلس الفاضل، ل١٤٥.

١٢١- کارل بوبر، الفکر الاشتراکی ل٣٦٤.

رەخنەیان هەیە(١٢٢) ئەمە دەزانن و ئەم خەیاڵە بەو (یوتۆپیا)و ئەفسانەیە دەزانن کە«لەسەری پەروەردە کرابوون» (١٢٣).

خەیاڵێکی تریش ئەوەیە کەچەوساندنەوەی گەل لەکۆمەڵگای کۆمۆنیستدا نامێنێ، لێرەشدا قسەی ئەلکساندەر هێرزنHerzenی روسی (١٨١٢-١٨٧٠) دەهێنینەوە کەلەبارەی ئەو کۆمۆنیزمەی کە(مانیفێستۆ) پێشبینی ی بۆ دەکرد دەیوت کەوا کۆمۆنیزم هەر ئۆتۆکراسی یە رووسی یە کە یە (واتە حوکمی لەپەراو سەرەو خوار دانراوە)(١٢٤).

وەك ووتمان لای مارکس «دەبێ» کۆمەڵگای کۆمۆنیست بەرپابێ، ئەم (دەبێ) یاخود ئەم (حتمیة)یەش بۆتە جێگەی رەخنەی زۆر لەمارکسیەت. مارکسیەت ئەم (حتمي)یەتەی خستۆتە قاڵبی زانست بەڵام حەقیقەت ئەوەیە کەئەمە بۆچوونێکی نازانستی یە چونکە هەموو ئەو هۆکارانە دەخاتە ئەولاوە کەبۆیان هەیە بێنە کایەوەو رەوتی رووداوەکان بگۆڕن. مارکسیش وەکو پێغەمبەرێك قسەی دەکرد لەبارەی ئەم (دەبێ)یە بەڵام زانیمان کەوا پێغەمبەرێکی ساختە بوو و دەبوایە باسی هیچ (حتمیة)یێکی نەکردایە.

## و- جۆری ئاسیایی ی بەرهەم هێنان

مارکس لەیەك دوو نووسراوی‌دا باسی ئەم جۆرەی کردووە. لەیەکێتی سۆڤێتیش پاش مونالەشالی (تەبلیس)و (لینینگراد) لە (١٩٣٠-١٩٣١) ئەم جۆرە خرایە ئەولاو بەبیرێکی دژ بەمارکسیەت زانراو کرایە جۆرێکی ئاسیایی ی دەرەبەگایەتی(١٢٥).

لەووڵاتی (چین)یش‌دا دوژمنایەتی ی زۆری ئەم جۆرە کرا(١٢٦) هەر لەبەرئەوەی چین هیچی لەرۆژئاوا کەمتر نەبێ ئەگەر نەخشەی پێنج قۆناغەکەی بەسەردا نەچەسپێ(١٢٧). پاش تاوانبارکردنی (ستالین)و (ستالینیەت)یش بایەخ درایەوە بەم جۆرە بەڵام دەستکاری ی هەندێك بۆچوونی مارکس کرا.

بەڵام ئەم جۆرەی بەرهەم هێنان کەبۆ چارەسەری کێشەیەکی فیکری مارکسی وەرگیرابوو خۆی لەخۆی‌دا کێشەی تێدا هەیە. بۆ نموونە لەوڵاتێکی وەکو عێراق

---

١٢٢- بەڵام لەلایەکی ترەوە وا دەزانم ئەم جۆرە (اعتراف)انە هی بێ جوێنە ئینا! چونکە هی کەسانێکە لەئەوروپای رۆژئاوادا دەژین واتە وەکو کلو رەخنەیان لێ دەگیرێ بۆیە ناچارن پاشگەز بنەوەو جوێنەئیان نی یە دیفاع لە خەیاڵەکانیان بکەن. (مەگەر کەملیکیان نەبێ کەبە لەئامەنەوە اعتراف دەکەن).

١٢٣- سانتیاگۆ کاریلۆ، الاوروشيوعية والدولة، ل١٨.

١٢٤- کزال، الماركسية والفوضوية ل٦١. (ئۆتۆکراسی) حوکمی تاکەکەسێکە کەبەرەهایی حوکم دەکات.

١٢٥- ی. فارگا، له حول نمط الانتاج الاسيوي ل٦٣.

١٢٦- جان شێنۆ، لە هەمان سەرچاوەدا، ل٢٩.

١٢٧- شراەر دانکۆس، الماركسية اللينينية امام مشاكل..... ل١٢٣.

کۆن خاوەنێتی ی تایبەتی ی زەوی هەبوو، واتە تاکەکان زەوی ی خۆیان هەبوو ئەمەش کەلەگەڵ (جۆری ئاسیایی)دا ناگونجێ کەگوایە زەوی تیایدا مەشاعی یە، بۆیە هەندێك نووسەری سۆڤیێتی شێوازی بەرهەم هێنان لەعێراقی کۆن دا بە(کۆیلایەتی) دەزانن(۱۲۸). بەلاّم هەندێك هەن بە(جۆری ئاسیایی)ی دەزانن و دلن بەوەدا نانێن کەخاوەنێتی ی تایبەتی زەوی هەبووبێ(۱۲۹).

بەڵگەیەکیش لەسەر هەبوونی خاوەنێتی ی تایبەت ئەوەیە کە پاشای بابلی حامورابی (۱۷۹۲-۱۷۵۰ی پێش زایین) لەنامەیەکی دا بۆ فەرمانبەرێکی خۆی، باسی پاك کردنی جۆگەلەی ئاودێری دەکات و دەڵێ کەئەو خەڵکانەی زەوییان هەیە لەدەوروبەری جۆگەلەکە ئەمە بکەن(۱۳۰).

بەڵگەی تریش لەسەر هەبوونی زەوی ی تایبەت ئەوەیە کەخەڵکی عێراق زەوییەکانی خۆیان بەکرێ دەدا(۱۳۱) ئەگەر زەویش مەشاعی بوایە کەس نەیدەتوانی زەوی بەکرێ بدات.

کەواتە زەوی ی تایبەت هەبوو، لەهەمان کاتیش دا (کۆیلایەتی) جۆری بەرهەم هێنان نەبوو واتە نە(کۆیلایەتی)و نە(جۆری ئاسیایی) بە سەر عێراقی کۆن دا ناچەسپێ ئەمەش بەڵگەیەکە لەسەر ئەوەی کەلەعێراقی کۆن دا جۆری بەربلاّوی بەرهەم هێنان (واتە تەنها جۆرێك کەزاڵ بێ و ئەگەر هی تر هەبن ئەوا زۆر لاوەکین) نەبووە بۆچوونێکی تری مارکسیەت بەدرۆ دەکەوێتەوەو دەبێتە بەڵگەیەکی تر لەسەر تەسکی بیروبۆچوونەکانی.

هەڵبەتە مونافەشەی زمان ماوە بۆ ئەم جۆرە بەلاّم لەرەش نووسەکەدا دەپاڵێنەوەو تەنها ئەوە دەڵێین کەوا پێنەی (جۆری ئاسیایی) جگەلەوەی کەوەکو پینەکانی تر پینەیەکی بچووکە بۆ دڕاوییەکی گەورە هەروەها پینەکە خۆی بۆ خۆی شەق و شڕە.

---

۱۲۸- بۆ نموونە: قسطنطین سترووڤە لە العراق القديم، ل۳۹ بۆ کۆیلایەتی و ل۱۷و۱۹ بۆ خاوەنێتی ی تایبەت. هەندێك جگە لەوە (پەرستگا)و هەروەها (کۆشکی پاشا) زەوی ی زۆریان هەبووە.

۱۲۹- بڕوانە: د. عبدالرضا الطعان، الفكر السياسي في العراق القديم، ل۱۱۹. ئەبوونی ئەم خاوەنێتی یەش باوەڕی مارکس و ئەنگلز بوو. بڕوانە: جان شێنۆ، لە: حول نمط... ل۳۶.

۱۳۰- الفكر السياسي... ل۱٤٥.

۱۳۱- لیۆ ئۆپنهایم، بلاد مابين النهرين، ل۱۰٤و۱۰٦.

## ٥- زۆرخان و سەرخان

یەکەم رەخنە کەلەم بابەتە بگیرێ رەخنە کۆنەکەیە ئەویش: ئەگەر راست بێ هەموو سەردەمێك ئاین و فەلسەفەو هونەر.... ی تایبەتی خۆی هەبێ ئەویش بەهۆی باری کۆمەلآیەتی (بەتایبەتی بەرهەم هێنان و چینەکان...) کەواتە مارکسیەت بەرهەمی سەردەمی خۆیەتی و تەنها بۆ ئەو کاتە گونجاو بوو (ئەوە بەمەرجێك کەبۆ ئەو کاتە راست بوبێ کەراستیش نەبوو).

مارکس و ئێنگلز لەبۆچوونەکانیان بۆ (زۆرخان و سەرخان) لایان دەدا، بۆ نموونە مارکس رەخنە لە(پرودۆن)ی فەرەنسی دەگرێ و دەڵێ کەوا باروددۆخی ئابووری دەست بەسەر دەوڵەتدا دەگرێ بەڵام دوایی لەنامەیەکیدا بۆ (فۆن شڤایتزەر) پشتیی یەکی کردووە سەبارەت بەکارێکی حکومەتی (پرۆسیا)و(١٣٢) تیایدا دەسەلآتێکی گەورەتری داوەتە دەوڵەت بەسەر باروددۆخی ئابووری(١٣٣).

مارکس و ئێنگلز دەڵێن کەوا ئەو بیرو فیکرەیەی کەلەناو کۆمەڵگادا بەربلآوەو زاڵە بیرو فیکرەی چینە فەرمانرەواکەیە، هەروەها دەڵێن کەوا بیروباوەری شۆرشگێر واتای هەبوونی چینی شۆرشگێر دەدات(١٣٤).

وەکو هەموو قسە رەها (مطلق)ەکانی تری مارکسیەتیش -ئەو مارکسیەتەی کەبڕوای بەرەها نیەو دەیخاتە ئەولاوە- ئەم قسەیە زۆر بەرەهایی وتراوە لەکاتێکدا نموونەی زۆر هەن کەئەم قسەیە بەدرۆ دەخەنەوە، بۆ نموونە بزووتنەوە ئاینیەکەی (مارتن لوثەر) کەکەس ناتوانێ بڵێ کەوا هەڵقولآوی چینێکی دیاری کراوە، هەروەها پاش پەیدابوونی وەکو یەك لەناو دەرەبەگ و جووتیاردا بلآوبوەوە، کەواتە بۆچوونەکەی مارکس و ئێنگلز هەموو کات راست نیەو بەو رەهاییە نیە.

**ئێستاش باسی چەند روویەکی «سەرخان» دەکەین:**

**١- دەوڵەت**

لای مارکسیەت کەچینەکان هەبێ دەوڵەت هەیە، دەوڵەتیش رۆڵی چەوساندن و سەرکوت کردنی چینە ژێر دەستەکانی هەیە(١٣٥). تەنانەت لە کۆمەڵگای سۆشیالیستدا (کەسەرەتای سەرهەڵدانی کۆمەڵگای کۆمۆنیستە) دەوڵەتی پرۆلیتاریا چینەکانی تر سەرکوت دەکات.

---

١٣٢- گەورەترین دەولەتی ئەلەمانیا بوو پێش یەکگرتنی دەولەتەکان لەساڵی (١٨٧١)دا.

١٣٣- بڕوانە: فە.. ملونکه کارل مارکس.... ل٣٦٦-٣٦٧.

١٣٤- لەکتێبی (ئایدیۆلۆجیای ئەلەمانی) بڕوانە: گارۆدی، کارل مارکس.ــ ل١٠٠.

١٣٥- (جۆزێف فرانسیس پرۆدۆن)ی سۆشیالیست (١٨٠٩-١٨٩٥ زاینی) دەوڵەتی بەسەنتەر بەسەپێنەری کۆمەلآیەتی و بەخاوەنداری تایبەت، مارکسیش سوودی لێ وەرگرتبوو لە (بێ دەوڵەتی و ئەنارشیزمدا). بڕوانە: رواد الفکر الاشتراکی، ل٢٠٧ بەدواوە

ئەگەر سوود لەتێکۆشینەوە (ئەنترۆپۆلوجی) یەکان وەرگرین دەزانین کەوا ژمارەیەك لەکۆمەڵگا سەرەتاییەکان (یان وەکو خەڵك دەڵێ: دوا کەوتووەکان) نەچین و بەدەوڵەتیان هەیە هەر چەندە خاوەنێتی ی تایبەتیان هەیە، کەواتە بەپێچەوانەی مارکسیەت: مەرج نی یە هەر کەخاوەنێتی ی تایبەت هەبێ چین پەیدا بێ یان دەوڵەت دامەزرێ و پەیوەندی نێوان خاوەنێتی تایبەت و چینەکان لەلایەك و پەیدابوونی دەوڵەت لەلایەکی تر بەو رەهاییە نی یە کەمارکسیەت بۆی دەچێ.

تەنانەت لەرۆژئاوای نوێش دا کە زانیاری ی وردتر هەیە لەبارەیەوە مارکسی یەکی وەك(پلیخانۆف) دەکەوێتە دوو دڵی لەبارەی بەستنی درووستبوونی دەوڵەت بەبەرهەم هێنانەوە.

(پلیخانۆف) دان بەوەدا دەنێ کەوا «پێداویستیەکانی چالاکی یەکانی بەرهەم هێنانی کۆمەڵایەتی» کاری راستەوخۆیان نەکردۆتە سەر دەوڵەت لەرۆژئاوادا(١٣٦) بەڵام دوایی دەڵێ کەوا: (گەشەکردنی هێزە بەرهەمهێنەرەکانی کۆمەڵگا» دابەش کردنی کاری بەدوادا هات، ئەم دابەش کردنەش تارادەیەکی گەورە درووست بوونی دەوڵەت لێك دەداتەوە(١٣٧).

قسەی یەکەمیش نارێکە لەگەڵ قسەی دووەمدا بۆیە لێرەدا ناچار دەبێ بڵێ (تارادەیەك) کەبەکارهێنانی لێرەدا و بەم شێوەیە دەیکاتە خوشك یان برای (رەنگەو لەوانەیە).

لەبارەی (نەمانی دەوڵەت) لەکۆمەڵگای چاوەڕێ کراوی کۆمۆنیستدا مارکس دەیوت کەوا هەر ئەوەندە پرۆلیتاریا سەرکەوێ دەوڵەت دەست دەکات بەهەڵوەشان.

نەمانی دەوڵەت، باوەڕێکی خەیاڵی ی تەنیا مارکس نەبوو، بەڵکو هی چەند کەسێکی تریش بوو، لەفەیلەسووفە کۆنەکانەوە(١٣٨) تا پرودۆن (١٨٠٩-١٨٦٩) و بلانکی (١٨٠٥-١٨٨١) و کەسانی تر. (بلانکی) بڕوای وابوو کەپاش سەرکەوتنی شۆڕشی پرۆلیتاریا (کەبەپێچەوانەی مارکسیەت لای ئەو بەهۆی کۆدەتای ژمارەیەکی کەمی شۆڕشگێر بەرپا دەبێ) پێویست نامێنێ بەدیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریا لەوەوە پێویست بەدەوڵەت نامێنێ.لەمەش دا مارکس مۆدەیەکی ئەو سەردەمە کاری تێ کردبوو ئەویش دوژمنایەتی دەوڵەت، بەڵکو دوژمنایەتی هەموو دەسەڵاتێك و حەز کردن بەنەمانیان ئەویش وەك کاردانەوەیەك دژی ستەمکاری یەکانی دەوڵەت. واتە بۆچوونەکەی مارکس لێرەدا لەبارەی نەمانی دەوڵەتەوە هەڵقوڵاوی فیکرەکەی خۆی نەبووە بەڵکو دیسان ئەمەشیان ئارەزوویەك بووەو تێهەڵکێشی فیکرەکەی خۆی کردووە.

---

١٣٦و١٣٧- پلیخانۆف، المفهوم المادي للتاريخ، ل٧٧.

١٣٨- لەفەیلەسووفە نوێکانیش (هیگل) لەنووسراوەکانی (١٧٩٦)ی دا بەلام لەمە پاشگەز بووە بڕوانە: هـ. ماركيوز، العقل والثورة، هيجل ونشأة النظرية الاجتماعية، ل٣٦.

(لینیش) دوای شۆڕشی (١٩١٧) دەیوت کەوا ئەم نەمانەی دەوڵەت (هەروەها هاتنە کایەی کۆمۆنیزم) پاش دە یان بیست ساڵی تر روو دەدات(١٣٩) کەچی وەك زانراوە دوای ئەم ماوەیە دەزگاکانی دەوڵەت قەبەتر بوون و دەستیان گرت بە سەر گشت لایەنەکانی ژیانی کۆمەڵگاو دەوڵەتێکی (تۆتالیتاری)(١٤٠)ی وا دروست بوو کەلەمێژوودا نموونەی کەمە.

بەهەر حاڵ واقیع دەری خست کەوا نەدیکتاتۆریەتی پرولیتاریا بەرپا بوو. نەدەوڵەت لەناوچوو بەڵکو لەجیاتی نەمانی دەوڵەت و لەجیاتی دیکتاتۆریەتی چینی کرێکار دیکتاتۆریەتی دەوڵەت بەڵکو هی حزبی کۆمۆنیست بەڵکو لەمەش دیکتاتۆری تر: دیکتاتۆریەتی لیژنەی مەرکەزیی حزب بەڵکو لەمەش خراپتر دیکتاتۆریەتی یەك کەس کە(لینین) بوو، پاشان (ستالین).

هەڵوێستی (پلێخانۆف) رەخنەی لەهەڵوێستی (لینین) دەگرت و دەیووت لینین دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریاو دیکتاتۆریەتی «سەروو پرۆلیتاریا» تێکەڵ بەیەك دەکات و پادشایەتیی رەها (الملكية المطلقة)(١٤١) دەخاتە کار(١٤٢).

(ترۆتسکی)ش هەروا رەخنەی لەم دیکتاتۆریەتە گرتبوو لەپلێخانۆف خراپتر(١٤٣).. ئەمەش هەموو پێش شۆڕشی (١٩١٧) -بزانە بەر لەوەی لینین دەسەڵاتی بچێتە دەست- پاش شۆڕشەکەش لەساڵی (١٩١٩) کاربەدەستی (حزبی) دەیوت کەوا هەموو کاروباری حزب (لیژنەی مەرکەزی) دەیکات بەڵکو تەنانەت ئەم (لیژنەیە)یەش وجودی نییە وەك دەزگایەکی جەماعی و لەجیاتی ئەوە: «هەڤاڵ لینین و هەڤاڵ سفردلۆف(؟) بڕیار دەدەن لەسەرمەسەلەکانی رۆژانە کاتێك نێوان خۆیان قسە دەکەن یان لەگەڵ هەڤاڵی تر»(١٤٤).

لینینیش جارێکیان (ساڵی ١٩١٩) ئیعتراف بەدیکتاتۆریەتی تاکە حزب دەکات و سوور دەبێ لەسەری(١٤٥) لەکۆنگرەی دوازدەی حزبیش (ساڵی ١٩٢٣) -کەلینین تیایدا بەشدار نەبوو- دیسان باسی ئەم دیکتاتۆریەتە کرا بەڵام پاش ساڵێك (ستالین) دەیوت کەوا ئەم دیکتاتۆریەتە «قسەی هیچە»و کەوا باس کردنی لەبڕیاری کۆنگرەدا «هەڵەبوو» بوو(١٤٦)!

---

١٣٩- ف. هـ. کار، ثورة البلاشفة، ل٢٣٩.

١٤٠- توتالیتاری: دەست گرتنی دەوڵەت یان رژێم بەسەر هەموو بوارەکانی ژیانی کۆمەڵگاو تاکەکەسەکان.

١٤١- پادشایی رەهایی: حوکمی ئۆتۆکراسی یە کەتیایدا پاشا خۆی بەرەهایی حوکم دەکات.

١٤٢- ف. کار، ثورة البلاشفة، ل٣٩.

١٤٣- هەمان سەرچاوە، ل٤٠.

١٤٤- هەمان سەرچاوە، ل١٩٢.

١٤٥- هەمان سەرچاوە، ل٢٢٩.

١٤٦- هەمان سەرچاوە، ل٢٢٩-٢٣٠.

بەڵام چۆن سەهوویەك؟! سەهوویەك كەملیۆنەها كەسی داپلۆست...جائیتر ئەو كەسانەی كەدەیانەوێ رووی كۆمۆنیزم سپی بكەن‌و بڵێن كەوا تاوانەكانی كۆمۆنیزم (ستالین)ی لادەر بەرپای كردبوون چۆن لەو راستیەیە خۆیان دەشارنەوە كەوا لینین بەدیكتاتۆریەتەكەی خۆی رێی خۆش كرد بۆ دیكتاتۆریەتەكەی ستالین؟ بەڵێ: لینین خوێنەكەی رشت‌و ستالین تا مل خۆی تیا نقوم كرد.!.

بەڵام بانەختێك بگەڕێینەوە دواوە: سەرچاوەی دیكتاتۆریەكە ماركس‌و ئینگلز بوو. (پرودۆن) ماركسی بەدیكتاتۆر زانیبوو و دەیوت كەوا رەفتاری خراپ لەگەڵ هاوڕێ سۆشیالیستەكانی دەكرد(١٤٧)، ئەم دیكتاتۆریەش (كەقین لەدڵ‌و خۆ بەگەورە زانین‌و رەخنەی كوێرانەی توندی چوونە پاڵ) بووە هۆی دووركەتنی هەموو كەس لێی كەم كەس نەبێ(١٤٨) بریندار كردنی خەڵكی تریش شێوەیەكی رەخنەگرتنی ماركس‌و ئینگلز بوو، ماركسیەروسەكانیش ئەمەیان لێ وەرگرت‌و لەوان زیاتر بەكاریان دەهێنا(١٤٩) ئێمەش كەماركسیەكۆن‌و نوێكان دەناسین شارەزای زمانی دڕێژیان‌و دڕند پێی‌یانین‌و چاك دەزانین كەچۆن چەكی ئەوان تەنیا چەند جنێوێكی جووراوی وەكوا (كۆنەپەرست‌ لو قەی تر لەم بابەتەو تەنیا گاڵتە كردنە بەوێ ئەوەی كەهیچ زانیاری‌یەكیان بەدەستەوە بێ تەنانەت لەفیكرەكەی خۆشیان (هەڵبەتە كەم كەسیان نەبێ) لەبەرئەوەش شایەنی لەوەن كەچەكی خۆیان لەدژیان بەكار بهێنری‌و گاڵتە بەعەقڵە خەیاڵاوەكەیان بكرێ بەپاڵ ئەوەی كە راستیەیە زانست‌و مێژوویی‌و واقعی‌یەكان بەكاربهێنرێن بۆ ئاشكرا كردنی فیكرە پڕ خەیاڵەكەیان.

كەواتە بەكورتی؛

١- مەرج نی یە پەیوەندی هەبێ نێوان هەبوونی چینەكان‌و پەیدابوونی دەوڵەت.

٢- دەوڵەتی یەكەی سۆشیالیست‌و دەوڵەتەكانی دوای لەو بەشۆڕشێكی سەرتاسەری كرێكاران پەیدا نەبوون بەڵكو بەهۆی كۆدەتاو داگیركردنی سەرپاری‌و شۆڕشی تاڵێكی بچووك هاتنە كایەوە.

٣- ئەو دەوڵەتەی كەدەبوایە پاش شۆڕشی پرۆلیتاریا نەمایە بووە لەم دێوە زمەبەی كەسەدان ملیۆن كەس بەدەستیەوە دەیاناڵاند.

---

١٤٧- كۆل، رواد الفكر الاشتراكي، ل٣٠٦.

١٤٨- بۆ نموونە ی تر بڕوانە كلاوپی؛ (مێژووی ماركسی؛ كارل ماركس، ل١٤٣-١٤٥، ١٥٦،١٦٤، ٢٣٢، ٢٦٧-٢٦٨.

١٤٩- كۆل، الماركسية والفوضوية، ل١١٧.

## ب- ئاین

قسەی مارکس «ئاین ئەفیونی گەلانە» دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کاتەی کە «فۆیەرباخی» بوو نەك «مارکسی»(١٥٠) واتە بەر لەوەی بگاتە ئەو قەناعەتەی کەئاین یەکێکە لەلایەنەکانی (سەرخان)و لە(ژێرخان)ەوە هەڵقوڵێ، مارکسیش لەکاتی «فۆیەرباخیتی»یەکەیدا وای باوەڕ بوو کەرەخنەگرتن لەئاین مەرجی هەموو رەخنەیەکە، واتە هەموو رەخنەکان لەرەخنە لەئاینەوە دەست پێ دەکەن.

بەڵام مارکس لەو شوێنەی کەباسی (ئەفیون) دەکات دەڵێ کەوا بێ نەوایی ی ئاینی لەلایەك دەربڕینی بێ نەوایی ی واقعی یەو لەلایەکی تر دەربڕینی نارەزایی یە لەدژی ئەم بێ نەوایی یە واقعی یە (رەخنە لەفەلسەفەی (ماف)ی هێگل -ساڵی ١٨٤٤)(١٥١) واتە ژێك بۆتەوە لە(تیشك دانەوەی ژێرخان) واتە سەرخان تیشکدانەوەی ژێرخانە..... دوای مارکس ئەمەی بەئاشکرایی لە (سەرمایە)دا ووتووە(١٥٢).

لای (گارۆدی)ش دەربڕینی نارەزایی رۆڵێکی ئیجابی ی هەیەو(١٥٣) گارۆدی -کەهێشتا مارکسی بوو- دەڵێ کەوا ئاین لەهەموو کات و شوێنێکدا مرۆڤ دوورناخاتەوە لەکارکردن و خەبات کردن و(١٥٤) چەند نموونەیەکیش بۆ ئەمە دەهێنێتەوە.

ئاین بەپێی مارکسیەت هەڵقوڵاوی ژێرخانە واتە ئەنجامێکی باری کۆمەڵایەتی یە (بەتایبەتی: ئابووری و بەرهەم هێنان)، ئاینیش وەکو هەموو لایەنێکی تری ژێرخان دەبێ پاش گۆڕانی باری کۆمەڵایەتی بگۆڕێ (یان راستتر ماوەیەك پاش گۆڕانی باری کۆمەڵایەتی نەك یەکسەر) بەڵام ئاینی زۆری وا هەیە کەماوەیەکی یەکجار زۆر ماونەتەوە وەکو ئیسلام و یەهودیەت و نەصرانیەت و ئاینی (بوذی)و (هندۆکی)... هتد. ئەمە بۆ مانەوە، بۆ پەیدابوونی ئاینیش ئێنگلز -پاش مردنی مارکس- گەشەسەندنی ئاینی کۆن بەباری ئابووری نابەستێتەوەو دەڵێ کەوا قسەی پێچەوانەی ئەمە - واتە: بەستنی ئەو ئاینە بەباری ئابووری- «قسەیەکی بەتاڵە» (لەنامەیەکدا بۆ کونرادشیت-١٨٩٠)(١٥٥).

ئێنگلز پێش ئەوە (واتە: لەرەخنە لەدوورینگدا) دەڵێ کەوا مرۆڤ پەیوەندی نێوان ماددەو بیری نەدەزانی، لەوەشەوە ئەو بڕوایە پەیدا بوو کەدەکرێ لەش و گیان جیابنەوە، لەئەنجامیشدا بڕوا بەنەمری ی گیان درووست بوو، پاشان بڕوا بەهەبوونی خوا(١٥٦).

---

١٥٠- د. محمود محمدسرای للفکر روجیه جارودي في الاشتراکیة والاسلام، الثقافة، ژمارە ٢، ١٩٧٨، ل٩٥.

١٥١-بڕوانە: کالفین، فکر کارل مارکس، مجلد١، ل٦٦.

١٥٢- مارکس، رأس المال، ج١، القسم الاول ١٠٣-١٠٤.

١٥٣- ر. گارۆدی، مارکسیة القرن العشرین، ل١٤٦.

١٥٤- هەمان سەرچاوە، ل١٤٧. ١٥٥- بڕوانە: هەمان سەرچاوە، ل١٦٢.

١٥٦- ئێنگلز، ضد دوهرنغ، ل٢٣٢.

ئەم بۆچوونەی ئینگلزیش تەنها قسەیەو بەڵگەی لە سەر نیە بەڵکو بەپێچەوانەی ئەمە

نموونەی عەرەبەکانی سەردەمی پێش ئیسلام هەیە کەبلومریان بەنەمری گیان نەبوو بەڵکو نەشیانیستبوو بەلأم لەهەمان کاتدا بڕوایان بەژمارەیەك بت بوو کەبەخوای خۆیانیان دەزانی. بەڵێ! ئینگلز غەیری ئەو فیکرە ئامادەیەی کەلەمێشکیدا هەیە (واتە: خوا نیەو سەرەتا ماددەیە) هیچ زانیاریەکی نادات دەست کەزانستی پێو گومانی تێدا نەبێو لەجیاتی ئەوە پەیدابوونی ئاین لە سەر بناغەی ئەو فیکرەیەی مێشکی (کەگریمانەیە-فرضیە) دامەزراندووە. واتە گریمانەی بیناکردووە لەسەر بناغەگریمانە (ظلمات بعضها فوق بعض)!

ئینگلز لەنوسراوی (لودفیگ فۆیەرباخ وکۆتایی فەلسەفەی کلاسیکی ئەڵمانی -١٨٨٨)دا لەسەیەکی ووتووە وەکو هی سەرەوە بەلأم پەیدابوونی خوداوەندەکان دەبەستێتەوە بەبەرجەستەکردنی هێزەکانی سروشت. پاشان بەهۆی رووت کرن (تجرید)ەوە باوەڕ بەخودا پەیدا بوو(١٥٧).

بەپێچەوانەی بۆچوونەکانی ئینگلز: پەیدابوونی (فرە خوداوەندی) دوای بڕوا بەهەبوونی (یەك خوا) ....زیاتر لەگەڵ مێژوودا گونجاوە. بۆ نموونە: لەجیاتی لەوەی کەلەعێراقی کۆندا خەڵکە کە بەرەو فیکرەی (یەك خوایی) بچن ئەماشا دەکەین خوداوەندەکانی لێو پۆیان لێ پەیدا دەبوو. باشترین نموونەش زانینی هەندێك پادشا بەخوداوەند. لەعێراقی کۆنداو بەپێی زانیاریە مێژوویەکان پادشای ئەکەدی (نارام سین)، (٢٢٩١- ٢٢٥٥)پێش زاین، بەئاشکرایی خۆی کردبووە خوداوەندو هێمای خوداوەندێتی خستۆتە پێش ناوی خۆیو کلأوی خوداوەندەکانی کردۆتە سەر. لەویش لە(میل)ەکەی کەبەبۆنەی سەرکەوتنی بە سەر گەلی (لولوبی)- یاخود لوللوبیەکان کەلەناوچەی سلێمانیو شارەزووردا دەژیان- دروستی کردبوو.

بەر لەوەشو بەپێی پەیکەرێك کەتێیك (زاخۆ) دۆزراببووەوە نارام سین ناوی هەر خوداوەندێكو ناوی ئەو شارەی کەمەڵبەندێتی دەهێنێ، پاشان دەڵێ کەوا ئەو خوداوەندانە ئەوانە خوازیوون کەنارام سین ببێتە خوداوەندی شاری (ئەکەد)(١٥٨).

نارام سین دەرگاکەی کردەوە بۆ پادشایانی پاش خۆی ئادوایی لەبنەماڵەی

---

١٥٧- ع. کاتانا، ن. انجلز نصوص مختارة، ل٦٠-٦١.

١٥٨- ئەمەش وەرگێڕانی (د. فوزی رشید)ە لەگۆڤاری سومر، ١٩٧٦،٣٢،ل٤٩-٥٨، لەهەمان ژمارەشدا وەرگێڕانی (د. عبدالهادی الفؤادي) بەئینگلیزی هەیە (ل٦٣-٧٥) کە ٠ ئاوالەکە بەگوێرەی تر وەرگێڕدراوە. کاتێکیش دوو وەرگێڕانی هەموو دەڵەکە بەراورد بکەی دەردەکەوێ کەئەوەی (د. فوزی) باشترە

سومەری‌یەکەی شاری (ئور)دا - کەبەزنجیرەی سێیەی ئور ناسراوە- شولگی (٢٠٩٥-٢٠٤٨) خۆی کردە خوداوەند. دوای ئەویش پاشاکانی دوای خۆی پاش ئەمانی بنەماڵەکە عێراق پەیرەوو لەپاشای (خۆ بەخواوەندزان) کەهەر یەکێکیان شوێنێکی بچووکی حوکم دەکرد.

نموونەیەکی تریش پەیدابوونی خوداوەندی گڵێنە (الطار) کەدیارە دروست کراوە چونکە لە سەردەمە کۆنەکانی چەرخی بەردین گڵێنە نەدۆزرابۆوەو دروست نەدەکرا.

لەمێژووی نوێش‌دا دەبینین کەوا گۆڕی شێخەکان بوونەتە مەزارو لەزۆر حاڵەت‌دا (شرك) پەیدا بووەو هەندێك تایەتی ی خوا دراوە بەشێخەکان وەکو چاك کردنی نەخۆش‌و دوعاکردن‌و پارانەوە لێیان. هەڵبەتە ئەگەر مەسەلەی پتەوی ی ئیسلام‌و کاری زاناو بانگخوازانی موسڵمان نەبوایە (فرە خوداوەندی)ای ئاشکرا پەیدا دەبوو. ئەم (فرە خوداوەندی‌یەی) کەئاینی تر لێی نەپارێزرابوون وەکو نەصرانیەت کەپەرستنی مەسیح‌و دایکی و وێنەکردنی (قدیس)و پەرستنیان (باناوی پەرستیشی لێ نەزانین).

جابزانین کەوا خەڵك - بەپێچەوانەی بۆچوونی ئینگلز- زیاتر لەرووت (مجرد)ەوە بەرەو بەرجەستە دەچن. واتە ئەگەر لەسەردەمێك‌دا خوایەکیان دەپەرست کەبەرجەستە نەبێ ئەوا دوایی بەرجەستەی دەکەن یان خوای تری بۆ دەکەنە شەریك کەبەرجەستە بێ ئەمەیش هۆیەکی پەیدابوونی پەرستنی هێزە سروشتی‌یە بەرجەستەکانی وەك خۆرو مانگ‌و ئەستێرە بوو. هەروەها پەیدابوونی پەرستنی ئەو بتانەی لەبەرد یان تەختە دروست کراون.

هەڵبەتە دەکرێ موناقەشەی زۆر بکەین‌و مێژوو پڕێتی لەئاینی جۆراو جۆر کەکەرەسەی باشن بۆ ئەو موناقەشەیە بەڵام ئەوەندە بەسە بڵێین کەوا ئینگلز بەمێشکی خۆی بۆ مەسەلەی ئاین چووەو بەڵگەیەکی زانستی‌و مێژوویی ی بەدەستەوە نەداوە.

ئێستاش دەچینە سەر تۆمەتی (ئەفیونی گەلان)و بزانین ئایا لەروی واقعەوە ئەمە راستە.

چەند نموونەیەك دەهێنینەوە لە سەر هەوڵەکانی بزووتنەوە ئاینی‌یەکان بۆ گۆڕینی کۆمەڵگا کەلەم هەوڵە لەگەڵ (حەشاشی)دا ناگونجێن. سەرەتاش ئاماژە بۆ ئیسلام دەکەین کەچۆن گۆڕانێکی بنەڕەتی ی بە سەر ژیانی کۆمەڵگاو تاکەکانی گەلانی رۆژهەڵات هێناو خەباتی گەورەی موسڵمانان لەپێناویدا هەروەها خەباتی گەورەی موسڵمانانی ئەمڕۆ کەرۆژهەڵات‌و رۆژئاوای هەژاندووەو مژدەی گۆڕانێکی گەورەی کۆمەڵایەتی‌و دەروونی‌و سیاسی‌وئابووری دەدات.

لەهەر دوو حاڵەتیش‌دا، موسڵمانی دوێنێ‌و موسڵمانی ئەمڕۆ. بەرگی (سلبیەت)یان داکەندووەو بوونەتە مرۆڤێکی ئیجابی‌و روویان کردۆتە خەڵکە تلیاکاوی‌یەکەو هەوڵی بێدارکردنەوەیان داوە. لەهەر دوو حاڵەتیش‌دا ئیسلامە کە ئیسلامی پاك‌و پوخت‌و دوور

لەخورافەت و بیدعەبەو ئیسلامێکە کەرازی نی بە فیکرەو بۆچوونی نامۆ بەخۆی تێکەڵ بێ.

جگە لەئیسلام ئەمە چەند نموونەیەکە لەسەر بزووتنەوەی ئاینی کەهەوڵی گۆڕینی کۆمەڵگایان داوە.

لەابۆهیمیا)دا هوس Huss (١٣٦٩-١٤١٥ی زاین) کەچاکخواز (مصلح)ێکی ئاینی بوو-شۆڕشێکی کۆمەلآیەتی و راپەڕی هەڵگیرساندبوو(١٥٩). هەروەها جەنگی جووتیاران لەئەڵەمانیادا بەسەرۆکایەتی تۆماس مونتزەر (سەدەی ١٦) بەرپابوو کەمارکس لەبارەیەوە دەڵێ کەوا پێشکەوتووترین پرۆژەی شۆڕشگێڕ بوو تاتاوەڕاستی سەدەی نۆزدەی زاینی(١٦٠). لای مونتزەر (پادشانشینی خوا-مملکة الرب) بریتی یە لەکۆمەڵگایەك کەئاغاو سەپان وخاوەنێتی ی تایبەتی تیدا نی یەو دەوڵەت و کڵێسە خۆیان بەسەر ویژدانی خەڵكدا ناسەپێنن(١٦١).

(گارۆدی)ش باسی قەشەی کاثۆلیکی کردووە کەلەجەنگی گەریلا (عصابات) لەئەمریکای خوارووندا بەشداری دەکەن و گەورەی قەشەکانیش رازی نابێ رێیان لێ بگرێ چونکە (لەهەر سالێك داسەدهەزار کەس بەهۆی برسێتی یەوەلەئەمازۆن دا دەمرن)(١٦٢).

جارێکی تر دەگەڕێینەوە بۆ ئیسلام بەلآم قسەی کۆمۆنیستەکان دەهێنینەوە. (تان مالاکا)ی کۆمۆنیستی ئەندەنووسی لەکۆنگرەی سێیەمی ئەنترناسیۆنالیزم (١٩٢١) رەخنەی لەلینین گرتبوو (لینینیش هێشتا مابوو) کەدژی کۆمەڵەی ئیسلامی Pan-Islamic بوو. بەپێی (مالاکا) ئیسلام لەجەرگەی خەباتی نەتەوایەتی دا دەژی واتە ناو جەرگەی خەباتی پێشکەوتنخوازو دژ بەئیمپریالیزم(١٦٣). لەکۆنگرەی چوارەمیش دا (١٩٢٢) دەیوت کەوا کۆمەڵەی ئیسلامی لە(جاوا)ی سەر بەئەندەنوسیادا ژمارەیەکی زۆری جوتیاری هەژاری تێدایەو زیندەڕۆ بوو لەشۆڕشگێڕیدا(١٦٤). پاشان چەند قسەیەك دەکات کەمەگەر موسڵمانێك بیانڵێ(١٦٥).

(حنیف ظفر)ی تورکستانی دەیوت کەوا (ئاینەکەمان) ئاینێکی جینایەتی نی یە بەڵکو لەسەرووی جینایەتی و جینەکانە(١٦٦). (سوڵتان گالیێف)یش ویستبووی تیۆرێك

---

١٥٩- گارۆدی، منعطف الاشتراکیة الکبیر ل٢٤٠و پەراوێزی وەرگێڕ.

١٦٠- گارۆدی، البدیل، ل١٠٢-١٠٤.

١٦١- هەمان سەرچاوە ل١٠٤.

١٦٢- رأی المفکر روجیە جارودی فی الاشتراکیة والاسلام عرض د. محمود محمد گۆڤاری الثقافة، ژمارە٢، ١٩٨٧/٢، ل١٣٠ پەراوێز.

١٦٣- مرلیو دانگلاس، الماركسية اللينينية... ل٦٠.

١٦٤- هەمان سەرچاوە ٢٣٧.

١٦٥- بۆ ئەم قسانە بڕوانە هەمان سەرچاوە، ل٢٣٦-٢٣٧.

١٦٦- هەمان سەرچاوە ل٥٢.

دابەزینێ نێوان کۆمۆنیزمو ئیسلام(١٦٧) (گالیێف) چەند باوەڕێکی هەبوو کە دەم مارکسی هەبووە بڕوای پێ بوون (لەوانەشە کەسی وا هەر نەبووبێ) وەکو ئەوەی کەوا مەسەلەی (یەکەمینێتی ی ماددە) قسەیەکی سەر بەمیتافیزیکەو بڕوای بەچەسپاندنی جیاجیای سۆشیالیزم هەبووە. لەوکاتەشدا کەرووسەکان چاوەڕێی شۆڕشی سۆشیالیستی رۆژئاوایان دەکرد ئەو دەیوت کەوا سۆشیالیزم لەرۆژهەلأتدا بەرپا دەبێ -لەبەر هەژاری-و رۆژئاوای دەوڵەمەند بەسۆشیالیزم قایل نابێ(١٦٨)- هەر واش بوو.

ئەم بیروباوەڕانەش بەڵگەن کەچەند جیاوازی هەیە نێوان بیری مارکسی یەکێ (مەزهەبی)و مارکسی یەك کەکراوەیە بەرامبەر بە (ئەفیونی گەلان).

بلێنزانین کەوا دوژمنایەتی مارکسیەت و سۆشیالیزم بەگشتی بۆ ئاین دەگەڕێتەوە بۆ هۆیەکی سیاسی چونکە زیاتر (فوضوية)Anarchism (١٦٩)و (یەعقوبیەتی کۆماری ی فەرەنسی -اليعقوبية الجمهورية)(١٧٠) بەبێ باوەڕ ناسرابوون. ئەگینا چ کۆمۆنیستو چ سۆشیالیستەکان بەزۆری بێ باوەڕ نەبوون (بێ باوەڕی بەواتای ئینکاری کردنی هەبونی خوا ئەگینا ئەو باوەڕەی ئەوان تەنها بەناو باوەڕە) چونکە لەلایەك بیروباوەڕی (سۆشیالیزی مەسیحی) هەبووە. کەسەرانی ڕیچی بوون لەلایێ Lamennais ی فەرەنسی (١٧٨٢-١٨٥٤) -هەرچەندە خۆی بەسۆشیالیست نەدەزانی-و بوشێ Bushez (١٧٩٦-١٨٦٥)ی هەروا فەرەنسیو لەدلۆو Ludlow (١٨٢١-١٩١١)و مۆریس Maurice (١٨٠٥-١٨٧٢)ی بەریتانی.... هتد(١٧١) تەنانەت (کاتێ) -کەلەسەرەتادا لەفەرەنسادا ناوی کۆمۆنیزم لەباوەڕەکانی ئەو زانیبوو-(١٧٢) کابرایەکی ئاییندار بووو بانگەوازی گەڕاتەوە بۆ نموونەی مەسیحو کۆمۆنیزی مەسیحی یەکۆنەکانی (واتە: ژیانی

---

١٦٧- هەمان سەرچاوە، ل٢٣٦، ٢٣٧.

١٦٨- بۆ لەوانەو قسەی تری گالییێف بڕوانە: د. ابراهيم الطحاوي، الاقتصاد الاسلامي...ل١٨٧-١٨٨. (گالتییێف) لەلیژنەی سەرکەزی حزبی شیوعی رووسی لەکۆنگرەی ساڵی (١٩٢٣) لەدەرکرا لەبەر ئەم بیروباوەڕانە ی.

١٦٩- باوەڕێکە دژی هەموو دەسەڵاتێك دەوەستێ، هەندێك (فوضوي) کۆمۆنیست بوون. ئەوانە ش کە (فوضوي)ان ناودارن: (باکونین)و (کروپوتکین) ی رووسی و (پرودۆن)ی فەرەنسی (ئەمیشیان گوایە بێ باوەڕ نەبووە).

١٧٠- یەعقوبیەکان پارتێکی کۆماری ی فەرەنسی ی توندڕەوو زۆرەبێ بوون ماوەی حوکمیان (١٧٩٣-١٧٩٤) بەماوەی تۆقاندن ناسراوە.

١٧١- بۆ ئەمانە بڕوانە: کۆل، رواد الفكر الاشتراكي، بەشی ١٦، ١٨، ٢٥ هەروەها: الماركسية والفوضوية.

١٧٢- رواد الفكر الاشتراكي، ل٢٠-٢١و ل١١٩.

سادەی ئەندامانی کڵێسەی یەکەم) بلاوده کردەوە(١٧٣).

ئەمە تاماوەیەك مایەوە بەلام پاپا (لیۆی سیازدەهەم) لەساڵی (١٨٧٨)دا فەرمانی دەرکرد کەسۆشیالیزم و کۆمۆنیزم دژ بەنەصرانیەتن بۆیە دەبوایە هەر نەصرانیەکی سەر بەکڵێسەی رۆما حاشای لەسۆشیالیزم بکردایە. لەمەشەوە بزوتنەوەی سۆشیالیستی بەتەولوی یەکی گرت لەگەڵ دوژمنایەتی کردنی ئاین(١٧٤).

کەواتە دوژمنایەتی کۆمۆنیزم بۆ ئاین (یان راستتر بڵێین: دوژمنایەتی ئاینی کۆمۆنیست بۆ ئاینەکانی تر) هۆیەکی سیاسی هەبوو نەك زانستی لێرەشدا قسەی (سولطان گالییف) دەهێنینەوە کەدەڵێ کەوا هیچ پەیوەندیەك نیە لەنێوان مادیەت و سۆشیالیزمدا(١٧٥).

چەندیش پێکەوە بەستنی کۆمۆنیزم و سۆشیالیزم لەگەڵ نەصرانیەت یان ئیسلام کارێکی پێنەگەریە، بەهەمان شێوە پێکەوە لکاندنی مادیەت و سۆشیالیزم پێنە کردنە. مرۆڤ دەتوانێ بڵێ موسلمانم و کۆمۆنیستم (بەلام بەم شێوەیە پینەگەریەکی سەفەت دەکات و لەئیسلام دەردەچێ) هەروەها دەشتوانێ بڵێ من پێ باوەرم و لەهەمان کاتدا کۆمۆنیستم لەم بارەشدا دیسان پینەگەریەکی سەقەت دەکات.

کەواتە وەك وتمان هەڵوێستی مارکسیەت لەئاین (ئەم جارەش دەڵێین: هەڵوێستی ئاینی مارکسی لەئاینەکانی تر) هەڵوێستێکە لەئەسڵدا سیاسیە نەك زانستی.

## ج- ئاکار (الاخلاق)

لای مارکسیەت: ١- ئەو ئاکارەی کەلەکۆمەڵگادا بەربلاوە بریتیە لەئاکاری چینی دەسەلاتدار. ٢- هەر چینێکیش ئاکاری تایبەتی خۆی هەیە. ٣-ئاکاریش نەسیە واتە بەپێی سەردەم دەگۆڕێ.

ئەگەر نەختێك لەمە وردبین بۆمان دەردەکەوێ کەوا رای یەکەم لەگەڵ رای دووەمدا ناگونجێ، چونکە ئەگەر هەر چینێك ئاکاری خۆیهەبێ واتەبۆ نمونە پرۆلیتاریا ئاکاری تایبەتی خۆی هەبێ کەجیابێت لەئاکاری بۆرجوازیەت کەواتە لەکۆمەڵگادا دوو جۆر ئاکارمان هەیە، لەبەر ئەوەش کە پرۆلیتاریا زۆرینەی کۆمەڵگایە (یان لەدوایدا دەبێتە زۆرینە) کەواتە ئاکاری ئەو دەبێ ئاکارە بەربلاوەکە بێ نەك ئاکاری چینی دەسەلاتدار.. هەمان شتیش بەسەر ئاکاری جوتیارەکانی کۆمەڵگای دەرەبەگی و کۆیلەکانی کۆمەڵگای کۆیلایەتیدا دەچەسپێ بەم شێوەیە دوو بۆچوونەکەی (١)و (٢)ی سەرەوە دژ بەیەکن.

هۆی بۆچوونی (٢) گەڕانەوەی کونرانەی هەموو لایەنێکی ژیانە بۆ لایەنی

---

١٧٣- هەمان سەرچاوە ل١٢٤.

١٧٤- بروانە: کۆنل لنارکسیة والشیوعیة. ل٢٥١ بەدواوە.

١٧٥- د. ابراهیم الطحاوی الاقتصاد الاسلامی.... ل١٨٧.

ئابووری‌و بەرهەم هێنان. بەڵێ گومانی تێدا نی‌یە کەلایەنی ئابوری کارێکی گەورەی هەیە لەسەر ئاکار، بەڵام ئەمجارەش وەکو هەموو جارێکی تر مارکسیەت زێدەڕۆ بوو لەم مەسەلەیەدا. بۆچوونی (ا)یش هیچ هۆیەکی نی‌یە بەڕای ئێمە غەیری ئەوەی کە«بسەلمێنرێ» کەوا ئاکارە بەدەکانی کۆمەڵگا خەتای چینی دەسەڵاتدارە واتە چینی چەوسێنەر. ڕاستە چینی دەسەڵاتدار کار دەکاتە سەر ئاکاری هەموو کۆمەڵگا بەڵام ئیبیمایەکی زۆر گەورەیە کەبووترێ کەوا ئاکاری ئەو چینە دەبێتە ئاکاری هەموو کۆمەڵگا ئەمەش جگە لەوەی -وەك وتمان- کەئەمە لەگەڵ بۆچوونی دووەمدا ناڕێکە.

سەبارەت بەڕای سێیەمی مارکسیەت گوایە ئاکار نی‌یە، ئێنگلز دەڵێ کەوا یاسای (دزی مەکە) یاسایەکی نەمر نی‌یە چونکە یاساکە لەو کۆمەڵگایەدا نامێنێ کەپاڵنەرەکانی دزی تیایدا نامێنن(۱۷٦) بەڵام ئەم قسەیە بەندی ئەو کۆمەڵگایە خەیاڵی‌یەیە. کۆمەڵگای کۆمۆنیست کەهەموو کەس تیایدا بەپێی پێداویستەکانی شتی دەست دەکەوێ. بێ گومان چینە دەوڵەمەندەکان نامێنن‌و زیا مەسرەفی نامێنێ بۆیە چاولێکەری نامێنێ‌و خەڵك بەپێی پێویستی خۆی مەسرەف دەکات‌و تەماعیان نامێنێ‌و دلوای کەمالیاتی زۆر ناکەن.

بەڵام لەم کۆمەڵگا ئەفسانەیی یەدا دەبێ بەرهەمەکان وەکو یەك بن: یەك جۆر سەیارەو جل‌و بەرگی وەکو یەك یان نزیك لەیەك خانووی یەك قەبارە... هتد. ئەگەر بێت‌و مۆدێلێکی سەیارەی نوێی پێشکەوتوو دابهێنرێ دەبێ خێرا چەند ملیۆنێکی لێ دروست بکرێ‌و دابەش بکرێ بەسەر هەموو هاوڵاتیانی کۆمەڵگای بەختەوەر نەوەکو ئەوانەی دەستیان نەکەوتووە تەماعی لێ بکەن‌و ئەو کاتە ڕوو بکەنە دزی‌و کۆمەڵگای بەختەوەر یاساو فەرمانی «دزی مەکە»ی تیادا زیندوو بێتەوە!

بەڵێ: ڕاستە ئاکار نی‌یە بەواتای ئەوەی کەقابیلی گۆڕانە بەڵام فەرمانە خوداییەکان دەمێننەوە وەك خۆیانە بۆ ئاکار مارکسیەتیش بڕوای پێ نی‌یە چونکە بڕوای بەئایینی خوایی نی‌یە.

### د- یاسا، فەلسەفە، هونەر

دیسان بەستنی ئەم لایەنانەی (سەرخان) بەلایەنی ئابووری‌یەوە لای مارکسیەت زۆر بەرەهایی باس دەکرێ‌و کارتێکردنی لایەنەکانی تر بەکارتێکردنێکی لاوەکی‌و پلە دوو زانراوە... هەڵبەتە بۆ هەموو کەسێك دیارە کەئەمە ڕاست نی‌یە تەنها نموونەی فەلسەفەی مارکسی خۆی بەسە بۆ ئەم مەبەستە. مارکسیەت -وەکو هەموو فیکرە سۆشیالیستەکانی سەدەی نۆزدە- بەرهەمی سەردەمی خۆیەتی، سەردەمی چەوساندنەوەی کرێکار.

ئەمەش پشتگیری بۆچوونە مارکسی‌یەکە دەکات لەبارەی بەستنی فەلسەفە بەلایەنی ئابووری بەڵام هەر ئەمە خۆی چەند ڕاستی‌یەکان بۆ ڕوون دەکاتەوە:

۱- نەك هەر مارکسیەت بەڵکو فیکرە سۆشیالیستەکانی تریش کەبۆ چینی

---

۱۷٦- هەمد نوسراوە. ل۱۵۸.

کرێکار هاتبوون بەرهەمی ئەو سەردەمەن. کەواتە بۆچی ئەو هەموو جیاوازییە لەنێوان ئەو فیکرە سۆشیالیستیانە هەبوو؟ ئایا باری کۆمەڵایەتی (بەتایبەتی ئابووری) یەك بار نەبوو؟

۲- جگە لەفیکرە سۆشیالیستەکان فیکرەی نەتەوایەتی زۆر گەشەی سەندبوو بەڵکو لەراستیدا سەدەی نۆزدە بەسەردەمی نەتەوایەتی ناسرابوو. ئەم فیکرەش هەڵقوڵاوی باری چینایەتی نەبوو بەڵکو هەڵقوڵاوی وەزعێکی نەتەوایەتی بوو بەتایبەتی لەئەڵمانیا کەبریتی بوو لەژمارەیەك ئەمارەت کەیەکیان نەگرتبوو.

۳- ئەگەر فەلسەفەش بناغەیەکی چینایەتی هەبێ ئیتر چ پێویست دەکات بانگەشە بۆ فیکرەی مارکسی لەکوردستاندا (کەفیکرەی چینی کرێکارە) بکرێ لەکاتێکدا چینی کرێکار چینێکی کزو لاوازە؟ ئایا ئەمە بازدان نییە بەسەر پەیوەندی نێوان (ژێرخان)و (سەرخان) کەمارکسیەت باوەڕی پێیەتی! ئەمەش نەك تەنیا لەکوردستان بەڵکو فیکرەی مارکسی لەناو رۆژهەڵاتدا ماوەیەك بڵاوبووەوە. ئەو رۆژهەڵاتەی کەچینی کرێکاری ئەگەر وەك هی کوردستانیش نەبێ ئەوا نەختێك لەو گەورەتر. ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەمارکسیەت بەپێچەوانەی پەیوەندی نێوان (ژێرخان)و (سەرخان) بڵاوبووەوە بەم شێوەیە پەیوەندییەکە بەو رەهاییە نییە کەمارکسیەت بۆی دەچێ(۱۷۷).

هەر لەبارەی فەلسەفەوە ئێنگلز دەڵێ کەوا فەلسەفەی یەکەم (واتە: فەلسەفەی هەرەکۆن) فەلسەفەیەکی ماددی بوو، پاشان فەلسەفەی ئایدیای (مثالی) ئەمەی نەفی کرد، لەکۆتاییشدا فەلسەفەی ماددیی نوێ ئەم فەلسەفە (مثالی)یەی نەفی کرد(۱۷۸).

بەر لەهەموو شتێکیش دەڵێین: هیچ بەڵگەیەکی مێژوویی نییە لەسەر ئەوەی کەوا یەکەم فەلسەفە فەلسەفەیەکی ماددی بووبێ بەڵکو ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ چۆنێتی پەیدابوونی ئاین لای ئێنگلز دەبینین کەوا سەرەتای پەیدابوونی ئاین پەیدابوونێکی ماددی نەبوو، ئێنگلزیش دوو بۆچوونی هەیە بۆ دوو شتی نزیك لەیەك. هۆکەشی زانراوە: ئاین «شتێکی خراپە» بۆیە دەبێ ماددی نەبێ، بەڵام فەلسەفە «شتێکی باشە» بۆیە دەبێ یەکەم فەلسەفە ماددی بوو بێ!

کەواتە «گومان» (واتە: بێ بەڵگەیی ی قسە لەبارەی فەلسەفەی یەکەم کەگوایە ماددی بوو) چووە پاڵ «ئارەزوو» -کەفەلسەفە باشەو ئاین خراپە- ئەم دوانە وایان لەئێنگلز کرد کەبەدوو جۆر بیریکاتەوە بەپێی ئەوەی هەست بەخۆی بکات.

---

۱۷۷- رەنگە هەندێک مارکسی بڵێن: مارکسییەت لایەنەکانی تری غەیری ئابووری و چینایەتی ژ[یان] بەرهەمهێنان رەچاو دەکات.. ئێمەش دەڵێین: بەڵێ ناچارە رەچاوی بکات، بەڵام هەتا لەگەڵ ئەم رەچاوکردنەشیدا (بنەمای یەکەم) یان (بناغەکە) هەرپەیوەستە و ئەگەر (شتی تر) هەبێ ئەوا (شتی یەکەم) هەیە، ئەویش ئابووری و چینایەتی.. هتد.

۱۷۸- ئێنگلس، خەمد دوەرتێ، ل۲۳۲.

ئینگلز هەر لەسەرەتاوە دەکەوێتە چاڵەوە بەلام هێشتا ماویەتی تیایدا نوقم بێ! وتمان هیچ بەلگەیەکی زانستی نی یە لەسەر ئەوەی کەفەلسەفەی یەکەم فەلسەفەیەکی ماددی بووەو ئەمە تەنیا رای ئینگلز خۆیەتی بەلام هەروەها دەپرسین: کێ دەڵێ فەلسەفەی ماددی‌ی نوێ فەلسەفەی (مثالي) نەفی کرد؟ ئینگلز «حەزی کردووە» شتی وابێ بەلام واقع بەدرۆی دەخاتەوەو لەوەندە فەلسەفەی جۆراوجۆری (مثالي) هەن ئەوەندە فەلسەفەی ماددی نی یە خۆ ئەگەر مەبەستی لەنەفی «پووچەڵ کردنەوە» بێ، واتە ماددی‌یەت مثالیەتی پووچەڵ کردەوە ئەوا قسەیەکی وتووە کەلەخەیاڵی خۆی دەری هێناوە(۱۷۹).

ئەمە سەبارەت بەلایەنی (فەلسەفە)، بێ گومان لایەنەکانی تر وەکو (یاساو (هونەر) لەو باشترنین و وەکو راهێنان بۆ خوێنەریان جێ بەهێڵین.

## چوارەم- «دیالێکتیکێتی»ی ماددی‌یەتی مێژوویی

پاش ئەوەی لەبەشی سێیەم دا زانیمان کەوا ئیدیعای ئەوەی کەماددی‌یەتی مێژوویی تەفسیرێکی زانستی یە بۆ کۆمەڵگاو مێژوو ئیدیعایەکی بێ بناغەیە واتە ماددی‌یەتی مێژوویی «زانستی» نی یەو پاش ئەوەی زانیمان کەوا لەناو خودی خۆیدا ناڕێکە دەمێنێتەوە بزانین کەئایا ماددی‌یەتی مێژوویی بەراستی «دیالێکتیکی»یە؟ ئەمەش وەك باسی ماددی‌یەتی دیالێکتیکی کەسەرەتا سەلماندمان کەوا باوەڕێکی زانستی نی یە، پاشان سەلماندمان کەدیالێکتیکیش نی یە.

هەڵبەتە بەسانە کەبزانین کەوا ماددی‌یەتی دیالێکتیکی‌و ماددیەتی مێژوویی زانستی نین بۆ ئەوەی کەپووچەڵی یەکەیان دەربکەوێ بەلام ئێمە هەوڵ دەدەین ئەوەش بسەلمێنین کەوا هەروەها دیالێکتیکی نین ئەوەش بەمەبەستی زیاتر روون کردنەوەی ئەو راستی‌یەی کەوا فیکری جاهیلی لەناو خودی خۆیدا ناڕێکەو کەوا ئەو شتانەی کەئیدیعایان دەکات بۆ خۆی جگە لەوەی راست نین هەروەها لەخۆیدا بەدی نایەن.

۱- بەشی زۆری ئەو چالاکیانەی کەمارکسیەت باسیان دەکات دیالێکتیکی نین بەڵکو شێوەهێڵێ (=خطي)ن واتە (أ) دەبێتە هۆ بۆ (ب) ئەمیشیان هۆ بۆ (ج)... هتد. بەلام دیالێکتیك وانی یە. بۆ نموونە کاری بەرهەم‌هێنان لەسەر دروستکردنی هۆشی مرۆڤ‌و هۆشی کۆمەلایەتی... ئەمەش دیالێکتیك نی یە.. جا بۆ ئەوەی مارکسیەت تام‌و بۆیەکی دیالێکتیکی بداتە چالاکیەکی وا دەڵێ کەوا ئەم دوو شتە کار لەیەکتر دەکەن.. بەلام ئەمە سوودی نی یە چونکە ئەگەر لەمارکسیەك بپرسین: هۆش هەڵقولاوی چی یە؟ دەڵێ: هەڵقولاوی بەرهەم‌هێنانە... کەواتە هەر دە بێ (أ) هەبێ‌و (ب) بەدوایدا هاتبێ کەئەمەش پەیوەندیێکی شێوە هێڵە (خطي) نەك دیالێکتیکی.

---

۱۷۹- ئەم رەخنەیەمان دیفاع نی یە لەفەلسەفەی (مثالي) چونکە ئەویش وەکو فەلسەفەی ماددی گومڕایی یە.

بەهەمان شێوەش بۆ بلوەرێنکی تری مارکسیەت ئەویش: گۆڕانی هێزەکانی بەرهەمهێنان گۆڕانی پەیوەندیەکانی بەرهەمهێنانی بەدواوەیە. کەئەمەش پەیوەندیێکی شێوەهێڵە نەك دیالێکتیکی.

دیسان بۆ پەیوەندی نێوان (ژێرخان)و (سەرخان) کەیەکەمیان دووەمیان دەست نیشان دەکاتو پەیوەندەکەیان دیالێکتیکی نیە.

٢- لەململانەی چینەکاندا دەبوایە بەپێی فەیلەسوفانی یەکەی دیالێکتیك دەرەبەگایەتی پەیدا نەبووایە بەڵکو کۆیلەکان شێوازێکی تریان پێنك بهێنایە چونکە کۆیلەکانو خاوەنەکانیان دوو چینی دژ بەیەك بوونو بەپێی دیالێکتیك دەبوایە دژێك سەربکەوتایە کە کۆیلەکانن. بەڵام دەبینین پاش کۆیلایەتی دەرەبەگایەتی بەرپابوو، هەمان شتیش بۆ دەرەبەگایەتی: دەبوایە دژەکەی تر واتە جوتیارەکان سەرکەوتنایەو شێوازێکیان پێنك بهێنایە کەچی شێوازی سەرمایەدار پەیدا بوو. بۆ جاری سێیەمیش دیالێکتیك پەکی دەکەوێو لەجیاتی ئەوەی کرێکاران زاڵ بن بەسەر سەرمایەداراندا دەبینین حزبێك رێگای کۆمۆنیزم خۆش دەکات (هەرچەندە خۆشی نەکردو کۆمۆنیزم هەر نەهاتەدی) کەدەستەیەکی ژمارە کەمەو هەڵبژاردەیە نەك رێبڕێن لەهەموو جەماوەرە کرێکارەکە.

سەبارەت بەکۆمەڵگای خەیاڵی کۆمۆنیست، ئەو (تناقض)و دژایەتیەی لەنێوان چینەکاندا هەبووە (وەك پێشتر باسمان کرد) لەو کۆمەڵگا خەیاڵیەدا نامێنن کەواتە دیالێکتیك دەمرێ بەڵام بۆ ئەوەی ئەو دیالێکتیکە نەمرێ لێنین (حیلة شرعیة)ی دۆزیەوە گوایە (تناقض) هەر دەمێنێت بەڵام نادوژمنانەنو نابنە هۆی شەڕو ناکۆکی!

# کۆتایی

پاش ئەم رەخنە کورتەی مارکسیەت ژمارە یەك راستیمان بۆ دەرکەوت کەهەر استی یەکیان لایەکی مارکسیەت دەڕووخێنێ.

١- مارکسیەت لەسەردەمێکدا پەیدا بوو کەچەند فەلسەفەیەکی بەخۆیەوە دیبوو کەئیدیعای (شمولیەت)یان دەکرد گوایە هەموو لایەنێکی ژیان دەگرێتەوە. مارکسیەتیش ویستی لەوان کەمتر نەبێ و ویستی لایەنی سروشت و کۆمەڵگاو مێژووو دوارۆژ... هتد بگرێتەوە بەڵام وەك بینیمان لەهەر بوارێکدا تا مل نوقمی هەڵە دەبوو لەلایەنە تاك تاکەکانی ژیاندا یەکی دەکەوت چ جای هەموو لایەنێکی ژیان بگرێتەوە.

٢- مارکسیەت چەند شتێکی ناڕێکی لەخۆی کۆکردەوە جا فیکری جاهیلی خۆی لەخۆیدا ناڕێکە ئیتر ئەگەر شتی ناڕێك کۆبکاتەوە دەبێ چی لێ دەربچێ؟ لەبەر ئەوەش مارکسیەت پڕ بوو لە(التناقض)و ناڕێکی و هەر شتێکی دژی ئەوەی ترەو بەدرۆی دەخاتەوە وەك چۆن لەرەخنەکەدا بینیمان.

٣- بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا مارکسیەت ئیدیعای گەورە گەورە دەکات: هەر ئەو تەفسیری زانستی ی مێژووو جوڵەی کۆمەڵگاو سروشتی زیندووو مردوو دەکات. دوارۆژ بۆ کۆمەڵگا خەیاڵییەکەی ئەوە. هەموو لایەنێکی گەردوون و ژیان دەگرێتەوە. فیکرەیەکی پێشکەوتنخوازە.... هتد.

خۆ ئەگەر ئاینێك بوایە لەلایەن خواوە بهاتایە دەیتوانی ئەم ئیدیعایانە بکات چونکە دەمانووت سەرچاوەی ئەو ئاینە خوایە کەقەد هەڵەی لێ ناوەشێتەوە. بەڵام ئەم ئیدیعا گەورانە کەلەفیکرێکی بەشەری بوەشێتەوە بەسن وەکو بەڵگە لەسەر نابوونی ی ئەو فیکرەیە.

٤- لەمەیدانی عەمەلیش دا مارکسیەت فەشەلی خۆی سەلماند چونکە نەیتوانی بۆ ماوەی سەدەیەك بەرگە بگرێ و بەشی هەرە زۆری دەوڵەتەکانی هەرەسیان هێناو یەکێك لەو هێزانەی کەدژی وەستان چینی کرێکار بوو. بەر لەوەش فەشەلی خۆی بەوە سەلماند -کە وەك پێشتر باسمان کردو سەدان جار وتراوە- شۆڕشەکە بەپێچەوانەی پێشبینییەکانی مارکس لەروسیادا بەرپا بوو کەچینی بۆرجوازی و چینی کرێکار تیایدا لاواز بوون. پاشان لەرۆژهەڵاتدا کەدەتوانین بڵێین دوو چینەکە تیایاندا وجودێکی وایان نەبوو.. واتە مارکسیەکان رێگایەکی تریان گرتە بەر بۆ بەرپاکردنی شۆڕشەکانیان.

جائەمڕۆش حزبە کۆمۆنیستەکانی ئەوروپای رۆژهەڵات هەوڵ دەدەن لەرێگای دیموکراسیەوە جارێکی تر بچنەوە پێشەوەو سوود وەربگرن لەفەشەلی سەرمایەداری کەبۆ ولاتەکەیان هاتووە.

٥- ئەنجامێکی مارکسیەت ئەوە بوو کەنەوەیەکی ذرندە پەروەردە کرا کەساڵ لەخوێن

رشتن نەکاتەوە کاتێک کەدەسەڵاتی لەدەستدا بێ. بێ گومان کەم کەسیان نەبێ کەبەرامبەر فیکرەی تر کراوەن یان کاتێ خۆی پەروەردەیەکی ئاینی یان هەبووەو جێباوی هەبووە لەدڵ و دەروونیان. باشترین بەڵگەش کاتێ لینین و ستالینە کەملیۆنەها کەس کوژران لەپێناوی سەپاندنی کۆمۆنیزمدا(١٨٠) هەروەها تاوانەکانی (چین) کەبەشێکی هەرە زۆری ئاشکرا نەکراون بەڵام بۆنیان دێتە بەتایبەتیش تاوانەکانی سەردەمی بەناو «شۆرشی رۆشنبیری» کەچینی لەمرۆ خۆی نەفرەتی لێ دەکات.. هەروەها تاوانەکانی (خمێر) سوورەکان لەکەمبۆدیاو پاشان تاوانەکانی ڤێتنام هەر لەکەمبۆدیا، تاوانەکانی رژێمە کۆنەکانی ئەوروپای رۆژهەڵات.. هتد.

لەوەش ناچێ ئاتەمرۆ حوکمێکی درندەی وەك حوکمی کۆمۆنیست لەمێژوودا دامەزرابێ(١٨١) هۆکەشی وەك وتمان پەروەردەیە کەباخەکەی بێ باوەڕییە.. کابرای بێ باوەڕیش کەبڕوای بەڕۆژێك نەبێ کەتیایدا موحاسەبە دەکرێ و لێی دەپرسرێتەوە سڵ لەتاوان ناکات بەڵام درندەترین تاوانبار ئەو بێباوەڕەیە کەنەك هەر بڕوای بەڕۆژی موحاسەبەکردن نەبێ بەڵکو هەروەها لەسەر رق و قین و دوژمنایەتی هەموو کەسێك پەروەردە بکرێ و دوژمنایەتی ئاین (ئاینی خوا) خاڵێکی سەرەکیی بەرنامەکەی بێ..

مارکس ساڵی (١٨٤٩) کاتێك بەنووسین هێرش دەباتە سەر حکومەت ئەمە دەنووسێ: کاتێك نۆرەی ئێمە دێت هیچ عوزرێك بۆ تیرۆر (ئیرهاب)ی خۆمان ناهێنینەوە(١٨٢).

ئۆوە کەمارکس و ئێنگلز بوون. (لینین)و (ستالین)یش چاندیان و کردیانە درەختێکی گەورەو باخەکەیان گەورەکرد بەچکەکانی تریش دەستیان کرد بەباخ دروست کردن..

چۆن باخێك و چۆ درەختێك؟

باخی قین و درندایی و درۆو دروشمبازی.. بەڵام باخی وا زوو خۆی خۆی دەسوتێنێ. ﴿وَمَثَلُ كَلِمَةٍ خَبِيثَةٍ كَشَجَرَةٍ خَبِيثَةٍ اجْتُثَّتْ مِن فَوْقِ الأَرْضِ مَا لَهَا مِن قَرَارٍ﴾ ابراهيم/٢٦.

نموونەی وشەیەکی پیس وەکو درەختێکی پیس وایە کەلەرەگدا هەڵکەندراوەو جێ بەخۆی ناگرێ.

---

١٨٠- تەنها بەهۆی نموونەش ئەمەیە: زیاد لە دە ملیۆن کەس لەبەندیخانەکان یان لەسەربازگەکاندا مردن، پاش ساڵی ١٩٣٦ (کاتی ستالین). کاروزدی ملحطف الاشتراکیة الکبیر، ل١٠٨.

١٨١- اکنازیو سیلونی (؟) کەیەکێك بوو لە دامەزرێنەرانی حزبی شیوعی ی ئیتال باسی ئەوە دەکات کە چۆن لینین و تروتسکی بێ (انصاف) بوون لە حوکم کردن بەسەر ئەوانەی رکانیان لەگەڵ هی خۆیاندا نەدەگونجان و بە(خۆفرۆش)و (مەلهەبەرست)و (بەکرێگیراو) ناویان دەبردن، هەروەها دەڵێ: کاتێك ویستم لە مۆسکۆ بگەڕێمەوە (ئەلکساندرا کولونتای) پێی وتم: ئەگەر لەرۆژنامەکاندا خوێندتەوە کەوا لینین سنی کرد گوایە کەرچکی زەویەتم دزیوە لە (کرملین) ئەوا بزانە کەلەگەڵدا رێك نیم لەبارەی کێشەیەکی بچوکی کشتوکاڵ یان پیشەسازی. بڕوانە: ئیدریش کوخ (؟)، اراء فلسفیة فی ازمة العصر، ل١٣١. بەم جۆرە ئەو کەسانەی لەم دوێشەوایانە، تێیان بوون بەزانین چۆن درندەو دیکتاتۆرێك بوون.

١٨٢- بڕوانە: میرینگ، کارل مارکس....، ل١٥٦.

# سەرچاوەکان

١- كارل ماركس، راس المال، نقد الاقتصاد السياسي، جزء١ قسم١، ت. محمد عيتاني، بيروت، سنة؟

٢- كارل ماركس، بؤس الفلسفة، ت. اندريه يازجي، ط٢، ١٩٦٧.

٣- فردريك انجلز ضد دوهرنغ، القسم الاول، الفلسفة، ت. داود صائغ، ١٩٥٤.

٤- فردريك انجلز نصوص مختارة، اختيار وتعليق: جان كانابا، ت.وصفي البني، دمشق، ١٩٧٢.

٥- ج. بليخانوف، تطور النظرة الواحدة الى التاريخ، ت. محمد مستجير مصطفى، ط٢ بيروت، ١٩٧٥.

٦- ج. بليخانوف، نقد نقادنا، ردود على منتقدي النظرية المادية التاريخية في تطور المجتمعات، ت. جورج طرابيشي، ط١، بيروت، ١٩٧٩.

٧- ج. بليخانوف، القضايا الاساسية في الماركسية، ت. حنا عبود، سنة؟

٨- ج. بليخانوف، فلسفة التاريخ -المفهوم المادي للتاريخ، ت؟، سنة ؟.

٩- ليون تروتسكي، الثورة المغدورة، نقد التجربة الستالينية، ت. رفيق سامر، ط٢، بيروت، ١٩٨٠.

١٠- د. الياس فرح، تطور الفكر الماركسي، عرض ونقد، ط٦، بيروت، ١٩٨١.

١١- ر. جارودي، منعطف الاشتراكية الكبير، ت. نوقان قرقوط، ط٢، ١٩٧٨.

١٢- ر. جارودي، ماركية القرن العشرين، ت. نزيه الحكيم، ط٣، بيروت، ١٩٧٢.

١٣- ر. جارودي، ب- تشاغين، الروح الحزبية في الفلسفة والعلوم، ت. نخبة من الاساتذة، بيروت، ١٩٥٩.

١٤- ر. جارودي، البديل، ت. جورج طرابيشي، بيروت، ١٩٧٢.

١٥- ر. جارودي، كارل ماركس، ت. جورج طرابيشي، بيروت، ١٩٧٠.

١٦- جان- ايف كالفين، فكر كارل ماركس، ت. سهيل ادريس، بيروت، ج١/١٩٦٠، ج٢/١٩٦٠.

١٧- ارنست فيشر، هكذا تكلم ماركس حقا، ت. محمد عتياني، ١٩٧٣.

١٨- نخبة من العلماء والاكاديميين السوفياتيين، الموسوعة الفلسفية، ت. سمير كرم، ط٥، بيروت، ١٩٨٠.

١٩- جان سوريه كانال واخرون، حول نمط الانتاج الاسيوي، ت. جورج طرابيشي، ط٢، بيروت، ١٩٧٨.

٢٠- فرانز مهرنغ، كارل ماركس تاريخ حياته (ونضاله)،ت. خليل الهندي،

بيروت، ١٩٧٢.

٢١- هنري لوفيفر، الازمة الماركسية الراهنة، ت، البير منصور وأحمد الزين، ١٩٦١.

٢٢- ف. بودوستنيك و أ. ياخوت، عرض موجز للمادية الديالكتيكية، دار التقدم، موسكو، ١٩٧٠.

٢٣- ف. افاناسييف، اسس الفلسفة الماركسية، ت. عبدالرزاق الصافي، بغداد، ١٩٧٦.

٢٤- د. قباري محمد اسماعيل، علم الانسان، الاسكندرية، ١٩٧٣.

٢٥- ج.د.هـ كول، تأريخ الفكر الاشتراكي، الجزء الاول؛ رواد الفكر الاشتراكي (١٧٨٩-١٨٥٠)، ت. منير البعلبكي، ط٢، بيروت، ١٩٧٨.

٢٦- ج.د.هـ كول، تأريخ الفكر الاشتراكي، الجزء الثاني، الماركسية والفوضوية، (١٨٥٠-١٨٩٠)، ت. عبدالكريم احمد، القاهرة، سنة؟

٢٧- محمود امين العالم، ماركيوز أو فلسفة الطريق المسدود، بيروت، ١٩٧٢.

٢٨- ريمون ارون، صراع الطبقات، ت. عبدالحميد الكاتب، بيروت، ١٩٦٥.

٢٩- اديث كيرزويل، عصر البنيوية من ليفي شتراوس الى فوكو، ت. جابر عصفور، بغداد، ١٩٨٥.

٣٠- د. ابراهيم الطحاوي، الاقتصاد الاسلامي مذهبا ونظاما دراسة مقارنة، ج٢، القاهرة، ١٩٧٤.

٣١- شمس الدين اق بلوت، داروين ونظرية التطور، ت. اورخان محمد علي ١٩٨٤، (وەرگێڕانە كوردیيەكەشی: ئايا راستە تيۆری داروين هەرەسی هێنا، وەرگێڕانی: سالار احمد فتاح، ١٩٨٦).

٣٢- ميلوفان دجيلاس، مجتمع غير كامل، الشيوعية المتفككة، ت؟، سنة؟.

٣٣- جان بول سارتر، المادية والثورة، ت؟، بيروت، ١٩٨٠.

٣٤- د. امام عبدالفتاح امام، خرافة الجدل في الطبيعة، مجلة الفصول الاربعة (ليبيا) سنة٢، عدد٧، ١٩٧٩.

٣٥- امام عبدالفتاح امام، المنهج الجدلي عند هيجل، دار المعارف، مصر، ١٩٦٩.

٣٦- د. زكريا ابراهيم، هيجل أو المثالية المطلقة، ج١، ١٩٧٠(*).

٣٧- سانتياغو كاريللو (السكرتير العام للحزب الشيوعي الاسباني)، الاوروشيوعية والدولة، ت.د. سعاد محمد خضر، منشورات دار الثقافة، بغداد، ١٩٧٨.

٣٨- ا.هـ كار، ثورة البلاشفة، المجلد الاول، (١٩١٧-١٩٢٣) ت؟ سنة؟

٣٩- ستيوارت شرام، هيلين كاريير دنكوس، الماركسية اللينينية امام مشاكل الثورة في العالم غير الاوروبي، (ئاوى ئەسلی: ماركسیەت وئاسیا ١٨٥٣-١٩٦٤) ت؟، بيروت، ١٩٧٠.

٤٠- د. عبدالرضا الطعان، الفكر السياسي في العراق القديم، دار الرشيد، بغداد، ١٩٨١.

٤١- ليو اوبنهايم، بلاد مابين النهرين، ت. سعدي فيضي عبدالرزاق، بغداد، ١٩٨٧.

٤٢- جماعة من علماء الآثار السوفيتين، العراق القديم، دراسة تحليلية لاحواله الاقتصادية والاجتماعية، ت. سليم طه التكريتي، ط٢، بغداد، ١٩٨٦.

٤٣- مجلة الثقافة بغداد، الاعداد ١٩٧٨/٢+ ١٩٧٨/٣+ ١٩٧٨/٦.

٤٤- بونيفاتي كيدروف، الجدل ونفسه الماركسية، ت. الياس مرقص، مجلة دراسات عربية، بيروت، العدد ١٢، ت ١٩٧٤/١.

٤٥- اروين كوخ، اراء فلسفية في ازمة العصر (١٩٥٩) ت. محمود محمود، القاهرة، ١٩٦٣.

٤٦- هربرت ماركيوز، العقل والثورة، هيجل ونشأة النظرية الاجتماعية، (١٩٦٠) ت. د. فؤاد زكريا، ١٩٧٠.

٤٧- نخبة من العلماء، كيمياء الحياة وفيزياءها، ت. د. محمد محمود عبدالقادر و د. الفونس يحيى، ١٩٦٢.

٤٨- د. احمد سيد النواوي، التركيب الدقيق للذرة وعلاقة ذلك بنشاطها الكيمياوي والطبيعي، ج١، ١٩٦٠.

٤٩- مجلة الف باء، بغداد، العدد١٠٢٤، ١٩٨٩/٥/١١.

٥٠- مجلة سومر، بغداد، المجلد ٣٢، ١٩٧٦.

51- M.E. Omelyanovsky, Dialectics in Modern Physics, Progress Publishers, Moscow (1977), Eng. Transl. 1979.

52- F.Nicolon, in, World Marxist Review, vol. 2, no.4. 1959.

53- N. Mondet,(*)Journal des Economistes, 15 nov., 1926.

54- Karl Mannheim, Ideology and Utopia, An Introduction to the Sociology of Knowledge, (1936), London, 1968.

(*) سەرچاوەی تریش هەن لەبارەی فەلسەفەی ئاینگ اوە کە لەرەش نووسەکەدا بەکارمان هێناون و لێرەدا لەمان نووسیون.

مارکسیەت یەکێکە لە ئاینەکانی ئەم سەردەمە، ئاینێکی دەستکردی مرۆڤە وەکو دەیانی تر، بەڵام هیچیان ئەوەندەی مارکسیەت ئیدیعای حەقیقەتی رەهایان بۆ خۆیان نەکردووە، مارکسیەتیش وەکو هەموو ئاینێکی دەستکردی تر پڕیەتی لە تاریکی.

ئەم باسە کورتەش بەشێکی زۆری ئەو تاریکییانە دەخاتە روو. وا ئەمڕۆش مارکسیەت هەرەسی هێناوە بەڵام دەرسەکان هەر دەمێننەوە بۆمان: چۆن بتوانین تاریکییەکانی ناو خودی هەر ئاینێکی جاهیلیەت بدۆزینەوەو پێشبینیی داڕووخانی ئەو ئاینە بکەین.

ژمارەی سپاردە (١٦٢ ... ١٩٩٦

چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری / هەولێر